# دەسەڵات و نەخۆشی

وەرگێڕانی

شێرزاد هەمینی

ديڤيد نۆين

# دەسەڵات و نەخۆشی

کتێبێکە باس لە بڕیارە سیاسییەکانی سەرۆکە نەخۆشەکان دەکات لە سەدەی ڕابووردوودا

وەرگێڕانی لە عەرەبییەوە
شێرزاد هەینی

حکومەتی هەرێمی کوردستان

وەزارەتی ڕۆشنبیری

بەڕێوەبەرایەتی گشتیی ڕۆژنامەنووسی و چاپ و بڵاوکردنەوە

بەڕێوەبەرایەتی خانەی وەرگێران

xaneywergeran@hotmail.com

- ناوی کتێب : دەسەڵات و نەخۆشی
- نووسەر: دیڤید ئۆین
- وەرگێڕانی لە عەرەبییەوە : شێرزاد هەینی
- بابەت : مێژوو
- پیتچنین : شێرزاد هەینی
- هەڵەبڕی : ئەحمەد مەحمود
- دیزاینی ناوەڕۆک : نزار نوری
- بەرگ : ئارام عەلی
- تیراژ : ٧٥٠
- زنجیرە : ٢٦٨
- چاپخانە : کارۆ
- چاپ : چاپی یەکەم ساڵی (٢٠١٠)
- ژمارەی سپاردن : (١٨٦٠) ساڵی (٢٠٠٩)

# پێرست

## بەشی یەکەم
### پەیوەندیی نێوان سیاسەتو پزیشکیو سیاسییەکانو دکتۆرەکان چییە...؟


پزیشکیو سیاسەت ........................................ ٢٢

سەرەتا........................................................ ٢٢

لە پەرلەمانو لە نەخۆشخانەدا........................... ٢٤

پەیوەندییە نهێنییەکان.................................... ٢٥

وەزیری دەرەوە ............................................. ٢٦

گەندەڵی دەسەڵات.......................................... ٢٦

ئاوەزو جەستە ................................................ ٢٨

دەستنیشانیان پێ ناکرێت ................................ ٢٩

جەماوەرو پزیشکیو سەرکردە ............................. ٣١

لەدەستدانی کارامەیی ...................................... ٣١

چ کاتێك سەرۆك لووتی بەرزدەبێت ....................... ٣٢

نەخۆشی دەسەڵات ........................................... ٣٤


## بەشی دووەم
### شای ئێران ساڵی ١٩٧٣ تووشی کانسەری لیمفە رژێنەکان بووە


نەخۆشییەکەی بەنهێنی مایەوە تا ساڵی ١٩٧٩و، تا باری تەندروستی

خراپ نەبوو ئاشکرای نەکرد................................ ٣٩

با بردوو ......................................................... ٤٠

کەسێکی پەککەوتوو ......................................... ٤٠

بەرەو رۆما ...................................................... ٤١

ساڤاك بۆ داپلۆسین ........................ ٤٢
پاش مردنی نهێنییەكانی دەزانرێت ........................ ٤٣
كێ نەخۆشە...؟ ........................ ٤٤
پێنج كەس ........................ ٤٦
نهێنییەك هەبوو شا خۆیشی نەیدەزانی ........................ ٤٨
نەخۆشییەكە ترسناك دەبێت ........................ ٤٩
بارێكی گران ........................ ٥٠
ژنەكەی دەزانێت ........................ ٥١

## بەشی سێیەم

### شا بەرنامەی وابوو تا ساڵی ١٩٨٣ لە دەسەڵات بمێنێتەوە

پشتگوێخستنی باری تەندروستی ........................ ٥٥
ریفۆرمەكە زۆر دوا دەكەوێت ........................ ٥٦
شەقام بڵێسەی گرتبوو ........................ ٥٨
كشانەوەی دكتۆرە تایبەتییەكە ........................ ٥٩
نائومێدیو شپرزەیی ........................ ٥٩
تەنها پروپاگەندەیە ........................ ٦١
نەخۆشیو، ئاوابوونی شا ........................ ٦٣
دەرهێنانی زراو ........................ ٦٥

## بەشی چوارەم

### فرانسوا میتێران و كانسەری پرۆستات

نەخۆشی برژنێف لە قژی و بۆمبیدۆ لە میزەكەیدا زانرا ........................ ٧١
لە لووتكەی دەسەڵاتدا ........................ ٧٣
لە نهێنییەكانی دەوڵەت ........................ ٧٣
دكتۆرێكی ئاشكرابێژ ........................ ٧٥

دارودەستەکەی ئەوە بە درۆ دەخەنەوە ........................ ٧٦
پەیامەکە ..................................................... ٧٧
هەڵخەڵەتاندن لەجیاتی راشکاویی ............................ ٧٨
دکتۆرە دەبەنگەکان ............................................ ٧٩
گرفتێکی ئەخلاقی ................................................ ٨٠
رەوشێکی نائاسایی ............................................... ٨١

## بەشی پێنجەم
### رۆماتیزم لەبری کانسەر

بە فێڵەکانی خۆی میتێران نەخۆشییەکانی شاردۆتەوە ............ ٨٧
خەلاتێکی نازییانە ............................................. ٨٨
چەپکە گوڵێك لەسەر گۆڕی بیتان .............................. ٨٩
چیرۆکێکی شاراوە .............................................. ٩٠
دەربازبوونێکی شاراوە ......................................... ٩١
بنەماڵەیەکی هاوسەنگ ......................................... ٩١
گوێگرتن بۆ بەرژەوەندی سەرۆك ............................... ٩٣
دوو فڕۆکە بۆ گەشتەکانی خۆی ................................ ٩٤
وەڵامدانەوە زەحمەتەکە ........................................ ٩٦
تۆماری سەرۆکایەتی ئەو ........................................ ٩٦

## بەشی شەشەم
### میتێران لەکاتی شەڕی کەنداودا چالاك بوو، شوێنەواری نەخۆشیشی پێوە دیارنەبوو

داگیرکردنی کوێت ............................................... ١٠١
ئاشکرابوونی نهێنییەکە ........................................ ١٠٢
حکومەتی هاوبەش ............................................... ١٠٤
مردنەکە ......................................................... ١٠٦

## بەشی حەوتەم
### ئەنتۆنی ئایدن و نەخۆشی

دیۆمزمەی عەبدولناسرو شەڕی سوێس ........ ١١١
ژنان عاشقی ئەو دەبن........ ١١٤
بەدبەختی ........ ١١٤
دووەمەکەیان زۆرتر نیگەران بوو ........ ١١٥
دەستێوەردانی تەواو، بەڵام بێ سوود ........ ١١٦
لە کار وەستانی مێشکی چەرچڵ ........ ١١٧
کەسێکی زۆر زیاتر ناسراو........ ١١٨
جەمال عەبدولناسر ........ ١٢٠
کۆمەك بۆ بەنداوی ئەلعالی........ ١٢١

## بەشی هەشتەم
### ئایدن لە کاتی قەیرانەکەی ئەلسوێس دەرمانی زۆرتری خواردووە

ئایدن خۆی ساز دەکات........ ١٢٨
پەلاماردانی شارەکان........ ١٢٩
هەڵوێستی ئەمریکییەکان........ ١٣١
حەبی ئارامکردنەوە لە رووبەڕووبونەوەی قەیرانەکەدا........ ١٣٢
پلانگێڕان و سەرکزکردن........ ١٣٣
سەرکزەکان........ ١٣٦

## بەشی نۆیەم
### لە وڵاتانی دیموکراتیدا هەتا هەتایی نهێنییەکان بە شاراوەیی نامێنێتەوە

پەلاماردانەکە ........ ١٤١

چاکە دانەوە........................................١٤٢
لێکدانەوەیەکی هەڵە........................................١٤٣
قەیرانێکی دبلۆماسی........................................١٤٥
رووپۆش لەسەردانان........................................١٤٦
وەڵامدانەوەی هەڵخەڵەتاندنەکە........................................١٤٧
کۆتایی........................................١٤٩

## بەشی دەیەم
### کەنەدی نەخۆشییەکەی لە ئەمریکییەکان دەشارێتەوە

سەرۆك جۆن کەنەدی و نەخۆشی ئەدیسۆن........................................١٥٥
نەخۆشی بە دزی........................................١٥٦
هەڵەکانی ساڵی یەکەمی........................................١٥٧
نەخۆشی و چارەسەرییەکان........................................١٥٨
پەلاماردانێکی بێ بناغە...!........................................١٥٨
ئێسکێکی تەڕ........................................١٦٠
کۆڵۆنی دوازدە گرێ........................................١٦١
یەك ساڵی تر ناژی........................................١٦٣
تاقیکردنەوەی ئازایەتی........................................١٦٤
لێکهەڵوەشانەوەکە........................................١٦٧

## بەشی یازدەهەم
### ئەو دکتۆرەی چارەسەری کەنەدی دەکرد، مۆڵەتی کاری نەمابوو

سەرۆك لە ماسولکەکانی ئاسوودەیە........................................١٧٢
ئێف بی ئای دەرمانەکە دەدۆزێتەوە........................................١٧٢
نیگەرانییەکی زۆر........................................١٧٤

پرسیارێکی گرنگ ........................ ١٧٤
ئەو بەبێ ژن چۆن دەگوزەرێنێت...؟! ........................ ١٧٦
خوگرتن بە مادده سڕکەرەکانەوە ........................ ١٧٧
خورانی قوورگ ........................ ١٧٨
ژان و خەواڵوو بوون ........................ ١٧٨
حاڵەتێکی ترسناک ........................ ١٧٩
تەنها میدیا نەبێت ........................ ١٨٠
ماسولکە لاوازەکان ........................ ١٨١
تارمایی ئیفیلجبوون ........................ ١٨١
مانگە خۆشەکان ........................ ١٨٣
بەختیاری ........................ ١٨٤

## بەشی دوازدەهەم

### بۆش و بلێر لوتیان بەرزبوو

بلێر و بۆش ........................ ١٨٩
هەڵوێست و دژە هەڵوێستەکان ........................ ١٩٠
تاقیکردنەوەیەکی دەولی ........................ ١٩١
دەسەڵاتی بەرپرس یان دەسەڵاتی دەزگاکان...؟! ........................ ١٩٢
جۆرج بۆش ........................ ١٩٢
بەرەوپێشچوونی لوتبەرزییەکان لەلایەن بۆش و بلێرەوە ........................ ١٩٤
هێمای مەترسییەکان ........................ ١٩٤
گرنگیدانی زۆر بە راگەیاندن ........................ ١٩٥
چەقی رووداوەکە ........................ ١٩٦
جیاوازییەکان ........................ ١٩٧

## بەشی سیازدەهەم

### پاوڵ: پرسیبووی کەسی مەعقول هەیە بەدیلی سەدام بێت...؟

هەنگاوێکی هەڵە ........................ ٢٠٢
ئەو رێگایانەی بۆش هەڵیبژاردن ........................ ٢٠٣
راپۆرتێکی رەسمی ........................ ٢٠٥
رووداوە جۆراوجۆرەکان ........................ ٢٠٦
گوێ پێنەدان ........................ ٢٠٧
نایەوێ گوێ لە هیچ رابگرێت ........................ ٢٠٨
سوپا دەشکێت ........................ ٢٠٩
بیانوویەکان ........................ ٢١٠
لوتبەرزییەکەی بۆش پاش داگیرکردنەکە ........................ ٢١١

## بەشی چواردەهەم

### فشارە بەهێزەکەی رەوشی عێراق بلێری دووچاری نەخۆشی دڵ کردبوو

نەهێشتنی حیزبی بەعس ........................ ٢١٦
مەندوبی سامی ........................ ٢١٧
پاش شەڕەکە ........................ ٢١٨
هەڵەکانی سوپا ........................ ٢١٩
گۆڕانی رێگای کاروانەکە ........................ ٢٢٠
لوتبەرزییەکەی پاش داگیرکردنەکە ........................ ٢٢١

## بەشی پازدەهەم

### بۆش و بلێر لە نەفامییەوە تووشی لوتبەرزی هاتن

تێوەگلانێکی مەترسیدار ........................ ٢٢٧
کەلێنێك ... بۆ تێکدەرو تاوانبارەکان ........................ ٢٢٨

خاڵی وەرچەرخان.................................. ٢٢٨
دڵتەنگیو وازهێنان .................................. ٢٣٠
قەیرانەکەی لوبنان .................................. ٢٣٧
هەڵوێستێکی بەدڕەوشتانە .................................. ٢٣٧
شوێنەوارە کارەساتبارەکە .................................. ٢٣٨
ساڵی کۆتایی.................................. ٢٤٠

## بەشی شازدەهەم

### بۆشو بلێر لەرووی سیاسییەوە گەمە بە کارتی ئایین دەکەن

ئەوانە بۆ لوتبەرزی دەیانگرێت .................................. ٢٤٤
شانۆو ئەکتەر.................................. ٢٤٥
درۆ بووەتە عادەت .................................. ٢٤٧
کارتی ئایین .................................. ٢٤٩
رەوشی تەندروستی.................................. ٢٥١
تەندروستی بلێر .................................. ٢٥١
دکتۆرێك لەسەر پاسکیلەوە.................................. ٢٥٣

## بەشی حەڤدەهەم

### دەڵێن گوایە سەرۆك بۆش گەڕاوەتەوە سەر مەی خواردنەوە

ئەو ناخوێنێتەوەو کەسێکی رۆشنبیریش نییە .................................. ٢٦٠
ئاستی زیرەکی .................................. ٢٦١
یەك جار دواکەوتووە.................................. ٢٦٢
شێتی خۆبەزلزانین .................................. ٢٦٤

## لە نێوان دوو کەوانەدا

(ئــەم کتێبــە لەلایــەن لــۆرد دیڤیــد ئــۆین بــە زمــانی ئینگلیــزی نووسراوەو چاپکراوەو لە رۆژنامەی ئەلقەبەسی کوێتی بـە زنجیرە لـە رۆژانــی ٢٧ی مــایۆ تــا ١٢ای یونیــۆی ســاڵی ٢٠٠٩ بــە زمــانی عــەرەبی بڵاوکراوەتەوە. دیارە کەوا کتێبەکە چەندین لاپەڕەو راستی مێـژوویی بڕیــارە سیاســییەکانو دەســەڵاتی ســەرۆکە نــەخۆشــەکانی جیهــانی باسـکردووە، بــەڵام وا دیــارە چــەند بەشــێکی حیســاباتی خــۆی لەگــەڵ حکومەتەکەیـدا کـە ماوەیـەك تێیـدا وەزیـری دەرەوەی بریتانیـا بـووە ساغکردبێتەوە. ئەو لە سەردەمی حکومەتی جیمس کالاهان لە ساڵانی حــەفتاکانی ســەدەی رابــردوو وەزیــری دەرەوەی برَیتانیــا بــووە. بەشـداربووە لـە دامەزرانـدنی حیزبـی سۆسـیال دیمـوکراتی بریتـانی، ماوەیەکیش سەرۆکی ئەو حیزبـە بـووە، ئێسـتاش دوا پۆسـتی ئەنـدامی ئەنجومــەنی لۆردانــە، ماوەیــەکی زۆر ســەرقاڵی بــاری تەندروســتی سەرۆکەکان بووە. نووسەرەکە چەندین کتێبی تری لـە بـواری سیاسیدا

هەیە، وەك (ئۆدیسای بەلکان)و (رەوشتی لوتبەرزی)و چەندی تریش.

من وا هەست دەکەم ناوەرۆکی ئەم کتێبە بابەتێکی زیندووەو کەم لە کوردستانو ناوچەکەمان ئازایانە ئاوڕی لێ دراوەتەوە، چونکە ماوەی حوکمڕانی سەرۆکەکانی ئەم ناوچەیە، تا مردنە لە کورسییەوە بۆ نەخۆشخانە، یان یەکسەر بۆ گۆڕستان بووە، لەو ماوەیەشدا کەس باسی نەکردوونو توێژینەوەی بابەتییانەیان لەسەر نەنووسراوە.

شێرزاد هەینی

ستۆکهۆلم

هاوینی ٢٠٠٩

# بڕیارە مێژووییەکان کە لەلایەن سەرکردە نەخۆشەکانەوە دراون

## پێشەکی

کتێبی دەسەڵاتو نەخۆشی، کە لە لایەن وەزیری دەرەوەی بریتانی پێشووتر (دیڤید ئۆین) نووسراوەو لە رۆژنامەی ئەلقەبەسی کوێتی بە زنجیرە بڵاوکراوەتەوە، لێکۆڵینەوەیەکە لەسەر باندۆری سەرۆکە نەخۆشەکانی جیهان. بابەتێکە لەسەر باندۆری نەخۆشییەکانو چارەسەرکردنەکانی بەدەنیو دەروونییان، لەسەر بەڕێوەبردنی دەسەڵاتو دەرکردنی بڕیارەکان، کە ئەنجامی بڕیارەکان کوێرانەو گێژانەو گەوجانە بووە.

نووسەرەکە بایەخی بەو سەرکردانە دابوو کە نەخۆشی ئاساییان نەبوو، کارو فەرمانەکانیان بە شێوەیەکی باش بەڕێوە دەبرد، بەڵام ئەوانە لەگەڵ لوتبەرزیو زۆرداری هاوسۆزبوون، ئەوەیان لە رەوشتیان دیاربووە، ئەوانە کەمیی وزەیان هەبوو، بڕوایان بە خۆیان نەبوو بۆ چارەکردنی کێشەکان، بۆیەش هیچ جۆرە ئامۆژگارییەکیان وەرنەدەگرت، ئامادەش نەبوون داوای هاوکاریش بکەن.

دکتۆر دیڤید ئۆین ماوەیەکی زۆریش سەرقاڵی پەیوەندییەکانی نێوان سیاسەتو پزیشکی بووە، خەریکی بەدواداچوونی نەخۆشی

سەرکردەکان بووە، کە ئەو نەخۆشیانە چۆن لەگەڵ ژیانیاندا گونجاوە، چۆن دەکرێ ئەو کۆمەڵگایانە لەو سەرکردە نەخۆشانەو لە نەخۆشییەکان بپارێزن.

ئەم کتێبە لە بەشی یەکەمو دووەمیدا باس لە نەخۆشییەکانی سەرۆکی وڵاتەکانی سەدەی بیستەم دەکات، بەتایبەتی ئەو سەرۆکانەی لە ماوەی ساڵانی ۱۹۰۱ تا ۲۰۰۷ دەسەڵاتیان بە دەست بووە، هەروەها کتێبەکە پێنج بەشی تێدایە کە رووداوە مێژووییەکان دەگێڕێتەوە، لە بەشێکیشدا باس لە نەخۆشی سەرۆك وەزیرانی بریتانی (ئەنتۆنی ئایدن) دەکات، بەتایبەتی لە کاتی رووداوەکەی کەناڵی سویس. بەشێکی تریشی باس لە هەڵسوکەوتو نەخۆشییەکەی (جۆن کەنەدی) دەکات لە ساڵی ۱۹٦۱ لە کاتی کێشەکەی دوورگەی بەرازەکانو کێشەی مووشەکە کوبییەکانو دیمانەی سەرۆکی سۆڤیەتی خرۆشۆف. هەروەها بەشێکی تایبەتە بە نەخۆشی سەرۆکی پێشووتری فەرەنسی فرانسوا میتێران، کە لە کاتی سەرۆکایەتیەکەیدا نەخۆشی کانسەری پرۆستاتی هەبووەو ماوەی ۱۱ ساڵ بە دەست ئەو نەخۆشییەوە ناڵاندوویەتی. بەشێکی تری کتێبەکە تەرخانە بە رەوشتی لوتبەرزیو خۆبەزلزانینی جۆرج بۆشو تۆنی بلێر.

٢

من وەك پزیشكێك ماوەیەك سەرقاڵی پەیوەندی سیاسەتمەداران و دكتۆرەكان بووم، بە درێژایی ژیانم لەگەڵ ئەو بابەتەدا خەریك بووم، لەبەرئەوەی من خۆشم پزیشك بووم بۆیە بایەخم بەو لایەنە داوە، ئاورم لە نەخۆشی سەركردەكان داوەتەوە كە بە درێژایی ژیانیان لەگەڵیاندا بوون. نەخۆشییەكان زۆر مەسەلەی گرنگیان وروژاندوەو كاریگەرییان لەسەر پرۆسەی بڕیاری ترسناك هەبووە، شاردنەوەی راستی نەخۆشی سەركردەكان لە سیستەمە دیموكراسییەكان و دیكتاتۆرەكان ئاسان نەبووە، دكتۆرەكانیش كە چارەسەری ئەو سەركردە نەخۆشانەیان كردووە، بەرپرسیەتیان دەكەوێتە سەرشان، ئایا ئەوان تەنها مەبەستیان خزمەتكردنی نەخۆشەكانیان بووە، وەك چۆن باو بووە...؟ یان مەبەستیان لە پاراستنی تەندروستی سەركردەكان هۆیەك بووە بۆ باش جێبەجێكردنی سیاسەتی وڵاتەكەیان...؟

ماوەیەكی دوورو درێژە ئەندامانی بنەماڵەكەمان پیشەی پزیشكیان هەبووە، یان كاریان لە پیشەیەكی تر كردووە كە لەو بوارەوە نزیك بووە، زۆریشیان لە سیاسەتدا كاریان كردووەو لەسەر ئاستی لۆكاڵیش رۆڵیان هەبووە، هەندێكیان سیاسەت و پزیشكیان بەیەكەوە كردووە.

## پزیشکی و سیاسەت

بۆیە منیش وا دەزانم‌و بە ئاساییشی دەزانم کە بواری پزیشکی‌و سیاسەت رۆڵی شەریکی لە ژیانی خەڵکدا ببینێت. ئەگەرچی سیاسەت لەسەر بوارە پزیشکییەکەم زاڵ بووە، من پەیوەندیم لەگەڵ سیاسەت هەر گەرم بووە، من پۆستی وەزارەتی دەرەوەم بینیووە، من خۆم لەناو دیکۆمێنتە رەسمییەکاندا بە لێزانی تەندروستی پێناسە کردووە، من هەر پۆستە سیاسییەکەم بە کاتیی زانیوە، من هەرگیز سیاسەتم نەکردۆتە پیشە، من لە هەموو پرۆسەکانی هەڵبژاردنەکاندا بەشدار دەبووم، هەموو کاتێکیش وام زانیوە لەو پرۆسەیەدا سەرناکەوم. دڵنیا نەبووم لەوەی دەردەچم، بەڵام لە کۆتاییدا ماوەی ٢٦ ساڵ وەك ئەندامی ئەنجومەنی عموم مامەوە، ئەوەش لە ماوەی هەموو هاورێیەکانم درێژتر بووە.

## سەرەتا

ژیانی من لە سەرەتاوە ئاوێتەیەك بوو لە پزیشکی‌و سیاسەت، من لە نەخۆشخانەی (سانت تۆماس) لەسەر رووباری تایمز بەرامبەر کۆشکی ویسنمستر لە لەندەن دکتۆرێکی نوێ بووم، بە شێوەیەك لە شێوەکان پزیشکی منی بردە ناو پۆلیتیك، من لە ساڵی ١٩٦٢ بۆ یەکەم جار بۆ هەڵبژاردنەکانی پەرلەمان کاندید کرام. من کە خوێندکاری کولێژ بووم لە سیاسەت نزیك بووم، کە ژیانی نالەباری هاولاتیانی

خـوارووی لەنـدەنم بـینی کـە دەکاتـە ناوچـەی خزمەتگوزاریـەکانی نەخۆشخانەی سانت تۆماس، برسیەتی ئەوانم هەست پێکرد، نـەبوونی یەکەی نیشتەجێیم زانی، بوومە ئەنـدام لـە حیزبـی کرێکاران، کە لـە سـاڵی ١٩٦٢ خوێنـدنم تـەواو کـرد، حیـزب داوای لـە مـن کـرد وەك پاڵێوراوی ناوچەیەکی لادێی گەورە خـۆم کاندیـد بکـەم، ئێسـتا زۆرم لا سەیرەو بـڕواش ناکـەم مـن چـۆن ئـەو بیرۆکـەیـەم قبـووڵ کـردو خـۆم کاندیـد کـرد، رەنگـە هۆکـاری سـەرەکی کـە مـن خـۆم هاویشـتۆتە ئـەو بازنەیە ئـەوەبوو کەوا زۆر سـەرقاڵی پزیشکی نـەبم، ژیـانم تـەنها لـەو بوارەدا سەرف نەکەم، چونکە ئەوەم باش دەزانی کەوا زۆر لـە هاوڕێیـە دکتۆرەکـانم لـە ژیـانی خۆیـان لـەو بـوارەدا ئەوەنـدە سـەرقاڵ دەبـوون ئاگایان لە هیچ بـواری تـر نـەدەما، زانیارییـان لـە لایـەنی ژیـانی گشـتی نـەبوو، رۆژنامەیـەکیان نەدەخوێنـدەوە، گوێیـان لـە رادیۆیـەك رانـەدەگرت، سـەیری بەرنامەیـەکی تەلـەڤزیۆنییان نـەدەکرد، بـواری هیچیان نەبوو، هەموو ژیانیان لـە نەخۆشـخانەکان سـەرف دەکـرد. مـن لە ساڵی ١٩٦٤ بۆ کـاری هەڵبژاردنـەکان مـاوەی سێ هەفتـە مۆڵـەتی بـێ مووچەم لە دائیرە وەرگرت، تا خەریکی بازنەکانی هەڵبژاردن بم، بەڵام لـەو هەڵبژاردنـەدا دەرنەچـووم. بۆیـەش کـە گەڕامـەوە نەخۆشـخانە لەسەر پۆلیتیك و خۆپاڵاوتن سارد بوومـەوەو زۆرتـر ڕووم لە پزیشکی کردەوە، بەڵام دوا بڕیارم نـەدابوو، من لـە هەڵبژاردنەکـەی سـاڵی ١٩٦٦دا لە پرۆسەیەکی چاوەڕوان نەکراودا بوومە ئەندام پەرلەمان.

## له پەرلەمان و له نەخۆشخانەدا

دوو ساڵ له نەخۆشخانەو له پەرلەمانیش کارم دەکرد، بەڵام که بوومه وەزیری دەریاوانی له ساڵی ١٩٦٨ەوە مەسەلەکه گۆڕا، چونکه لەودەمانەدا نەدەکرا کەسی وەزیر بێجگه له کاری وەزارەت هیچ پۆست و کاری تر بکات، بۆیه سەرقاڵی وەزارەت بووم، بەڵام که حیزبەکەمان حیزبی کرێکارانی بەریتانی هەڵبژاردنەکەی دۆڕاندو حکومەتەکەمان له دەست نەما، منیش له پۆستی وەزارەت نەمام، تەنها وەك پەرلەمانتارێك لەو حیزبه مامەوە، بۆیه بوارم بۆ سازبوو، وەك دکتۆرێك بگەڕێمەوە نەخۆشخانه، تا ساڵی ١٩٧٤ بوومه وەزیری تەندروستی، بەڵام که له ساڵی ١٩٧٧ تا ساڵی ١٩٧٩ پۆستی وەزارەتی دەرەوەم وەرگرتبوو، زۆر رازی بووم هەرگیز ئەوەندە به وەزیفەکەم دڵم خۆش نەبووم، ئەوەندە به کارەکەم شادمان نەبووم، هەروەها که له پۆستەکانی سەرۆکی حیزبی دیموکراسی کۆمەڵایەتی له نێوان ساڵانی ١٩٨٣ تا ١٩٨٧و له نێوان ساڵانی ١٩٨٨ تا ١٩٩٨و سەرۆکایەتی هاوبەشی کۆنفراسی تایبەت به یۆگۆسلافیای پێشوو له نێوان ساڵانی ١٩٩٢ تا ١٩٩٥ کارمکردووە.

## پەیوەندییە نهێنییەکان

ماوەی چەند ساڵێك وەك پزیشك لەو بوارەدا کارمکردووە، لەو ئەزموونە جوانەدا زۆر شت فێربووم، لەگەڵ چەندین پزیشك کارمکردووەو سیاسەتمەداری گەورەم چارەسەرکردووە، راستەوخۆ وزەو خۆماندووکردنی رۆژانەی کاری سیاسەتم هەست پێکردووەو لە پەیوەندییە نهێنییەکەی نێوان سیاسەت و دکتۆرەکان باش تێگەیشتووم، زۆریشم دیوە.

سیاسەتمەداری پایەدارم لە خولیابوون بە ئەلکحول چارەسەرکردووە، کەسانی سیاسیم دیوە دووچاری خەمۆکی دژوار هاتووە، زۆریان دەیانپرسی ئەو ئەرکە گرانانە چەند باندۆریان لەسەر باری تەندروستی هەیە، ئەو کارە قورسانە چەند نەخۆشمان دەخات. نەخۆشم لەوانە دیوە مادەی سڕکەریان هەڵمژیوەو خولیای موخەدەرات بوون.

لەوماوەیەی کە دکتۆر بووم و لە سیاسەت نزیك بووم باش شارەزا ببووم کە بڕیاری گرنگ لەسەر ئاستی سیاسی باڵا بدەم، لە ساڵی ١٩٦٢ ئاگاداری تەنگژەی مووشەکەکانی کوبا بووم، لە شەڕەکانی ڤێتنام نزیك بووم، کە لە ساڵی ١٩٧٢ لە وەزارەتی بەرگری کارمکردووە کتێبێکم لەسەر پرۆسەی بڕیاردان و مەترسییەکانی ئەو بڕیارانەو هەڵەکانی ئەو پێشهاتانەم نووسیبوو. هەمووتان ئەو قسە بە نرخەی (لۆرد ئاکتۆز) دەزانن کە وتبووی:

پاوەر بۆگەن دەبێت و دەسەڵاتی رەها هەمووی بۆگەنییە. یان قسە بە نرخەکەی مێژوونووسی ناودار (باربارە توشمان) دەزانن کە وتبووی: (هێزو پاوەر گەوجی بەرهەم دەهێنێت).

## وەزیری دەرەوە

کە مـن بوومـە وەزیـری دەرەوە، تێگەیشـتم نەخۆشـی کاریگـەری زۆری هەبوو لەسەر پرۆسەی بڕیاردانەکان لەناو حکومەتدا، ئـەوەم لـە زۆر بۆنەدا هەستپێدەکرد، زۆریـش بـە سـەرکردە تەنـدروست باشـەکان سەرسـام بـووم، ئەوانـە هەسـتی پێزانینیـان بـاش‌و کارامـەبوو، بـەڵام ئەوانە نەخۆشییەکی تریان هەبوو، ئەویش لووتبـەرزی بـوو، لـە وڵاتـە دیموکراسیەکان ئەوەیان بە چاودێری‌و پەرلەمان‌و حکومەت‌و میـدیاوە لە بن دەستی ئەو سەرکردە زۆردارانە دەرهێناوەو کۆنترۆڵیان کـردووە. ئـەو دیاردەیـە لـە وڵاتـانی تـری سیسـتەم دیکتاتۆریـەت، کـە چـاودێری دیموکراسی‌و پرینسیپ تێدا نەبووە، تەنها کودەتـای سـەربازی هـەبووە، یان گەمارۆو بایکوت‌و فشاری نێودەوڵەتی کاریگەری هەبووە، دیارە کـە چارەنووسـەکە بـەرەو داگیرکردنـی بێگانـە تـەواو بـووەو بوونەتـە چەندین هێمای پرسیار بۆ سەرکەوتنەکان‌و دەربازبوون.

## گەندەڵی دەسەڵات

من بەختیاربووم کە لـە حکومەتەکـەی سـەرۆك وەزیـران (هارۆلـد ویلسۆن)و (جیمس کالاهان) بەشداربووم، چونکە ئەوانە گەندەڵیان تـێ نەکـەوتبوو، یەکەمیان لـە هەڵبژاردنەکـەی سـاڵی ١٩٧٩ شکسـتی خـواردو دووەمیشـیان لـە هەڵبژاردنەکـەی سـاڵی ١٩٧٩ شکسـتی بەرکـەوت. ئەزموونەکـە دژواربـوو. بـەڵام کەسـی سیاسـی وەك چۆن کەسـێکە بـۆ

خزمەتی میللەتەکەی کار دەکات، بڕواشی وایە هەر دەمێك میللەتەکەی ئەو متمانەی لێوەرگرتەوە، پێی ئاساییەو لە پۆستەکەی دەکشێتەوە.

لە ماوەی پۆستەکەیدا لە نێوان سالانی ١٩٦٤ تا سالی ١٩٧٠ ویلسۆن دەسەلاتی ڕەهای هەبوو، ئەگەرچی ئەو لە بەرەی ئۆپۆزسیۆن بوو، لەسەرەتای حەفتاکانەوە چەند گرفتی تەندروستیشی هەبوو. کە لە سالی ١٩٧٤ دەسەلات وەردەگەرێتەوە، دەسەلاتی بیرکردنەوەی لاواز بوو، بۆیەش کۆمەلێك کێشەی سیاسیو ئابووری لەگەل گرفتە تەندروستییەکەی هاتووتە پێش، بەلام ئەو لە سالی ١٩٧٩و لەناکاو دەست لەکار دەکێشێتەوەو واز لە دەسەلاتەکەی دەهێنێت. ئەو پاش چەند سالێك تووشی نەخۆشی زهایمر دەبێتو چالاکی مێشکی نامینێت. پاش ئەو جیمس کالاهان دەبێتە سەرۆك وەزیران، ئەو بە تەمەن لە ویلسۆن گەورەتر بوو، ئەو لە سالی ١٩٧٢ نەشتەرگەری پرۆستاتی بۆ دەکەن، کە چاك دەبێتەوە لە سالی ١٩٧٤ دەبێتە وەزیری دەرەوە، کە دەبێتەوە سەرۆك وەزیران تەندروستی باش بووە، پاشان لە بەرامبەر مارگرێت تاتشر لە سالی ١٩٧٩ هەلبژاردنەکە دەدۆڕێنێت، بە شەرەفو بە کەرامەت لە داوننگ ستریت دەچێتە دەرەوە.

من لەگەل چوار سەرۆك وەزیران بووم لەوانە ئیدوارد هیپو مارگرێت تاتشرو جۆن میجەرو تۆنی بلێر. من کۆششم کردووە تەندروستیو نەخۆشی سەرۆك حکومەتەکانی هەموو جیهان سۆراخ بکەم، بەتایبەتی ئەوانەی پەیوەندیم پێوەیان هەبووە، ئەوەشم بۆ ئەوە بوو تا خوێنەرەکانم چاك بزانن کە چ جۆرە پەیوەندییەك لە نێوان ئەو دوو میتۆدەدا دەسلاتو نەخۆشی هەیە.

## ئاوەزو جەستە

قسەکردن لەسەر نەخۆشی جەستەیی سەرکردە سیاسییەکان بە ئاشکرا جیاوازە لەگەڵ ئەو سەرکردانەی نەخۆشی دەروونییان هەبووە، ئەوانەی ئاوەزیان تەندروست نەبووە، چونکە خەسڵەتەکانی نەخۆشە دەروونییەکانی وەك شێتی‌و وڕێنەو وەهمگری‌و لوتبەرزی‌و خۆبەگەورەزانین، لە کەسایەتییە زۆردارەکانی وەك (ئەدولف هیتلەر)و (عیدی ئەمین)و (ماوتسی تۆنگ)و (سلۆبودان میلوسڤیتش)و (رۆبرت موگابی)و (سەدام حوسێن) دا هەبووە. لەولاشەوە سەرکردە دیموکراسیخوازەکانیش وەك (تیودور رۆزفلت ٢٧ ی ئوکتۆبەر ١٨٥٨ - ٦ ی یەنایەر ١٩١٩)و (لیندون جۆنسۆن ٢٧ ی ئۆگستی ١٩٠٨ ٢٢ ی یەنایەری ١٩٧٣)و (ریتشارد نیکسۆن ٩ ی یەنایەری ١٩١٣ ٢٢ ی ئەپریل ١٩٩٤)و (مارگرێت تاتشر ١٣ ی ئوکتۆبەری ١٩٢٥)و (تۆنی بلێر ١٩٥٣)و (جۆرج بۆشی باوك ١٢ ی یونیۆی ١٩٢٤) ئەوانەیان هەبووە، بەلآم لە رووێکی ترەوە ئەوان جیاواز بوون. میدیاکان‌و رای گشتی زمانێك بەکاردەهێنن ئەو زمانە لەلایەن پزیشکەکانەوە راستکراوەتەوەو یان نەماوەو یان قەدەغەبووەو بەکار نەهاتووە. زۆر لەسەرکردەکان تووشی خەمۆکی‌و دلگرانی‌و نەخۆشیە دەروونییەکان دەبنەوە، بەلآم لە راپەڕاندنی کاری پۆستەکانیان سست نابن‌و شکست ناخۆن‌و بەکەڵکی دەسەلآت دەمینن، سەیرە کە حاڵەتی (ئابراهام لینکۆلن ١٢ ی فبرایری ١٨٠٩ ١٥ ی ئەپریلی ١٨٦٥) دەبینین، ئەگەرچی نەخۆشی خەمۆکی هەبووە بەلآم دەسەلآتی تۆکمە بووە. زۆرن ئەو سەرکردانەی وەك لینکۆلن دووچاری ئەو نەخۆشیەش هاتوون، بەلآم ئەو رازی نەبووە.

دەسبەرداری دەسەلاتەکەی ببێت. ئەو هەر لە گەنجییەوە مەزاجی تەواو نەبووەو زۆریش رەوشی خراپ بووە، جارێکیان لە وتاریکدا ئاماژەی بەوە دابوو کەوا نیازی خۆکوشتنی هەبووە، بەلام ئەو کە لەگەڵ خەلکدا بووە زۆر ئاسایی بووە بەلام تەنهاییەکەی بێزارو سەخلەتی کردووەو دلگران بووەو تا رادەیەك نەی وێراوە یەك چەقۆی بچووکیش هەلگرێت. ئەو یەکێکە لە مەزنترین سەرکردەکانی ئەمریکی کە توانیویەتی لەگەڵ نەخۆشییەکەی خۆی بگونجێنێتو کەسایەتی خۆی ساز بکات، یەکێك لە نووسەرانی کتێبەکانی لینکۆلن دەڵێت:

ئەو کەسێکی شێت نەبووە، بەلام رەنگە جۆرێك لە ناهاوکێشەییەکی تێدا بووە، هەروەها رۆزفلتو خرۆشوفیش ئەومیان هەبووە.

## دەستنیشانیان پێ ناکرێت

ئەگەر دکتۆرەکانیش دەستنیشانی شێتی سەرکردەکانیان کردبێت ئەوا هاولاتیان بروایان نەکردووەو سەرکردە مەزنەکانیان لەبەرچاو نەکەوتووە، ئەوان وەك سەرکردەی نەتەوەیی سەیریان کردوون. بەپێی راپۆرتێکی پزیشکی کە لەم دواییانەدا بلاوکراوەتەوە هەر یەك لە سەرۆك تیۆدۆر رۆزفلتو ليندون جۆنسۆن بێ مەزاج بووینەو هەستیان بە دلتوندی کردووەو لە ماوەی سەرۆکایەتییاندا ئەو نەخۆشیانەیان هەبووە. بەلام رای گشتی ئەومیان قبووڵ نەبووە کە بە

سەرکردە نەتەوەییەکانیان بلّێین نەخۆش بوون، یان لە رۆژانی حکومڕانیاندا نارەحەت بوون.

دەڵێن وینستۆن تشرشل هەمان نەخۆشی دەروونی هەبووە، بەڵام کەس ناتوانێت نکۆڵی لەوە بکات کەوا ئەو جۆرێك لە خەمۆکی هەبووە، کە خۆی ناوی لەو حاڵەتە دەروونیەی خۆی نابوو (سەگە رەشەکە)، بەڵام رازی نەبوو بە لوتبەرزیو بەخۆ بە زلزانین بلێت ئەوە نەخۆشییە.

زۆر لە نووسەرەکانی شانۆ باسیان لە لوتبەرزی دەسەڵاتدارەکان کردووەو ئاماژەیان بەو نەخۆشیە داوە، ئەوەشیان بە هەلزانیوە باس لە نەهامەتییەکانی مرۆڤایەتی لە سەردەمە ئاڵۆزەکاندا لەو روانگەوە بکەن، شکسپیر یەکێك بووە لەوانەی زۆر داهێنانی لەو بوارەدا کردووە. رەنگە هاوڵاتیان ئەوە لەسەرکردەکانیان بخوازن کەوا کەسانی زۆر نائاسایی بن، کەسانێك بن بیانەوێ زۆرترین کات کار بکەنو ماندوو نەبن، کەسانی وا بن زۆر بڕوایان بە کەسایەتی خۆیان هەبێت، بە کورتی ئەو جۆرە رەوشتو خەسڵەتانەش لەلای پیشەومرانی پزیشکی جۆرێکە لە شێتی. سەرکردەکان هیوادارن وەك چۆن میللەت دەخوازێت ئەوان وا بکەن، هیواو مەبەستەکانیان جێبەجێو مەیسەر بکەن، ئەو میللەتەش قبوڵ ناکات ئەو سەرکردانەیان بە کەسانی شێتو کاڵفام وەسف بکەن، ئەگەر سەرکردەکان پشتیوانی رای گشتیشیان نەمێنێت ئەوا ئەوان ئامادە نین، ئەو نازناوەی دکتۆرەکان بە سەرۆکەکانیان دەڵێن ئەوان قبووڵی بکەن.

## جەماوەرو پزیشکی و سەرکردە

پزیشکیی وەك جاران باس لە شێتبوونی خۆبەزلزانین وەك نەخۆشییەك ناكات، بەڵام جەماوەر بەردەوام ئەو دەستەواژەیە بەكاردەهێنێت، منیش جارێكیان لەلایەن رۆژنامەنووسێكەوە بەوە تاوانبار كرام، كەوا من دووچاری شێوەیەك لە شێوەكانی شێتبوونی خۆبەزلزانین هاتووم كە رازی نەدەبووم حیزبی دیموكراسی كۆمەڵایەتی لەگەڵ حیزبی كرێكاران لە ساڵی ١٩٨٧ یەكبگرنەوە، گوایە من لە ئاكامی تەنگەژەی عەقڵییەوە تووشی دەبەنگی هاتووم. كە دكتۆرەكان ئەو دەستەواژەیە بەكارناهێنن مانای ئەوە نییە جەماوەرەكەش بۆیان نییە ئەوە بەكاربهێنن، شێتی خۆبەزلزانین ئەگەر لەلایەن سیاسەتمەدارانەوە پەیڕەو كرا ترسناكە، بەتایبەتی ئەگەر لوتبەرزیشی لەگەڵدا بوو، رەنگە وەك بابەتێكی نوێ لە پیشەی پزیشكیدا لێكۆڵینەوەی لەسەر بكرێت، بەڵام هێشتا دیاردەی لوتبەرزی نەبوویتە زاراوەیەكی پزیشكی.

## لەدەستدانی كارامەیی

من وا دەزانم ئەو سەركردانەی لووتیان بەرزەو خۆیان بە گەورەو كاریزما دەزانن، كەسایەتییان لاوازەو كارامەییان نییە، لە پۆستەكانیشیان ناوەشێنەوە بۆیە ئەو دیاردەیان پێوەیە، ئەوانە زۆر بڕوا بە خۆیان دەكەن، گاڵتەیان بە ئامۆژگارییەكان دێت، سەیرو ئاوڕ

لە دیدی بەرامبەریان نادەنەوە، هەندێ جاریش بە چاوی کەمیش سەیری ڕێنمایی‌و ئامۆژگارییەکانیش دەکەن. من دەمەوێ ئەوە بزانم ئایا ڕەوشتی لوتبەرزی هەندێك لە سەرکردەکان بەندە بە کەسایەتی‌و ڕەوشتی خۆیانەوە، کە بەو جۆرە هەڵسوکەوت دەکەن‌و بەرامبەرەکانیان بەو چاوە دەبینن، یان ئەو دیاردەیە وا دەکات ئەو کەسە لوتبەرزانە بەو شێوەیە دەجوڵێنەوە، یان ئەوانە هەر کە دەگەنە دەسەڵات‌و پۆستە باڵاکان وەردەگرن، دەگەنە ئەو ڕەوشتەو بە شێوەیەکی ئاسایی ئارەزووی ئەو گەورەبوونە دەکەن. یان ئەو جۆرە سەرکردانە هەر گەیشتنە سەر کورسییەکەی دەسەڵات دەگۆڕێن‌و دەسەڵاتەکەیان هزریان دەشێوێنێت...؟

## چ کاتێك سەرۆك لووتی بەرزدەبێت

ئەوانەی دووچاری ئەو دیاردەیە دەبن، حەز دەکەن‌و کار بۆ ئەوە دەکەن ماوەیەکی دوورودرێژ لەسەر کورسی دەسەڵات بمێننەوە. من وا دەزانم ۳ تا ٤ لە دیاردەی ئەو نەخۆشییە پێوە دەبێت:

◄ سەیرکردنی جیهان وەك کۆڕمپانێك بۆ بەکارهێنانی دەسەڵاتەکە بۆ نەمری‌و شکۆیی، نەك پێگە کە وا ببینێت کێشەو گرفتی زۆری لە پێشەو پێویستی بە شێوازی براگماتی دوور لە نێرمیی هەمیە بۆ کارکردن.

◄ ئەوانە لە خۆڕسکەوە مەیلی ئەوەیان هەیە، خۆیان لێهاتوو کارامە نیشانبدەن.

◄ ئەوانە لە خۆرسکەوە مەیلی ئەومیان هەیە وێنەی خۆیان جوان بکەن.

◄ ئەوانە بایەخی زۆر بە وێنەو شێوەی خۆنیشاندان بە جەماوەر دەدەن.

◄ ئەوانە شێوازی تەبشیری لە قسەکردن لەسەر کارەکان‌و مەیلکردن بۆ شکۆدارکردنی خودی خۆیان هەیە.

◄ ئەوانە خۆیان وا بە دەوڵەتەوە دەبووسێنن، وەك دوو داردەی گیربوو (من دەوڵەتم‌و دەوڵەت منم).

◄ ئەوانە کە قسە دەکەن ئارەزوو دەکەن ئامرازی (ئێمە) بەکاربهێنن.

◄ ئەوانە بڕوابوونی ڕەهایان بە خودی خۆیان هەیە، کە دەتوانێت دەسەڵاتی بە سەر هەموو شتێکدا بشکێت، ئامۆژگارییو ڕەخنەکانی ئەوانی تر بە کەمیو بە رقەوە سەیر دەکەن.

◄ ئەوانە زێدەڕۆییان لە هەستکردن بە مەزنی کارکردن‌و کارامەیی خۆیان تێدایە.

◄ بڕوابوون بەوەی کە ئەوان لە بەرامبەر یاسا بەرپرس نین‌و رای گشتی ئەوان ناگرێتەوە، یان لە بەرامبەر خوداو مێژووش بەرپرس نین.

◄ بڕوابوون بەوەی کە حوکمی خوداو میژوو دەستیان ناگاتە ئەوان.

◄ ئەوانە بڕوایەکی پۆڵایین‌و ڕووبەڕووبوونەوەیەکی بەهێزو هەڵچوونیان تێدایە.

◄ ئەوانە تەواو لە واقیع دابڕاون، ئەوەش تەریبە لەگەڵ تەنهایی‌و دوورکەوتنەوە لە هەموو بوارەکانی جیهان.

◄ ئەوانە کار بۆ ئەوە دەکەن هەموو بۆچوونەکانی پابەند بە راستی ئەخلاقی‌و کارنامەکان لە لایەنەکانی تایبەتی‌و ئەنجامە نەخوازراوەکانیان نەکۆڵێتەوەو بە شێوەیەکی رەها ئەو جۆرە رامانانە رەفز دەکەنەوە.

◄ لەبەر کەماسی لە جێبەجێکردنی سیاسەتەکان کە جۆرێکە لە بۆگەنی چەقیو، واتە ئەوانە لە کارەکانیاندا لەبەر بڕوابوونی رەها بە کارەکانیان هەڵەی زەق دەکەن، دەستدەکەن بە پەردە دانان لەسەر دانوستانی باشەو خراپەکانی سیاسەتەکەی.

## نەخۆشی دەسەڵات

ئەو جۆرە کەسانە ئەو رەوشتەیان هەر لە تەمەنی هەژدە ساڵییەوە پێوە دەبێت تا دەمرن، ناکرێ بوونی دیاردەی لوتبەرزی بە دیاردەیەکی تایبەتی بناسرێت، ئەوەش لە کەسایەتی سەرکردەکانەوە دەبینرێت کە دەگەنە دەسەڵات، بەتایبەتی کە سەرکردەکە بۆ ماوەیەك دەسەڵاتەکەی بەهێز دەکاتو، ئەوەش بە نەمانی دەسەڵاتەکەی هەمان کەس ئەو دیاردەیەی نامینێت، بە کورتی ئەو نەخۆشیەکەی بەندە بە دەسەڵاتەوە، نەك بە کەسایەتییەکەیەوە. دیارە کەوا ئەو کەش‌وهەوایەی کەسەکە دەگەیێنێتە دەسەڵات رۆڵی هەیە لە تەسلیمبوونی سەرۆکەکە بەو دیاردەیە. فاکتەرە دەرەکییەکانیش

کەسەکە سەرکەوتوو دەکات بۆ گەیشتن بە دەسەلاّت و مانەوەی لەو پۆستەدا، ئەوەش سەرۆکەکە دەست والاّ دەکات بۆ شکاندنی کۆتە سیاسییەکان تا ئازادانە دەسەلاّتە تایبەتییەکەی وەك خۆی و وەك دەیەوێت بەکاربهێنێت، هەر ئەو فاکتەرانەش رۆڵیان هەیە لەوەدا کە ئەو سەرکردەیە ماوەی چەند ساڵ لەسەر کورسییەکە دەمێنێتەوە.

کۆمەڵگای پزیشکی ئامادە نییە، ئەو دیاردەیە، لوتبەرزی خۆ بەگەورە زانینە لە لیستی نەخۆشییەکان تۆمار بکات، وەك چۆن خەڵکەکە بە جۆرێك لە شێتبوون و گەوجیی دەزانن، بەلاّم ئەو کۆمەڵگە (پزیشکییە) زۆر بە دیسپلینە (لەوەشدا لەسەر حەقە) بۆ شێوەی بەکارهێنانی زمان، ئەوەش مانای ئەوە نییە ئەو جۆرە رامانانە لەلایەن فەیلەسوف و پارێزەرەکانەوە بەکاردێت، هەروەها لەلایەن پزیشکانیشەوە، من نالێم لەم کتێبەدا وەلاّمی ئەو رامانەم داوەتەوە.

# بەشی دووەم

## شای ئێران ساڵی ١٩٧٣ تووشی کانسەری لیمفە رژێنەکان بووە

## نەخۆشییەکەی بەنهێنی مایەوە تا ساڵی ١٩٧٩و، تا باری تەندروستی خراپ نەبوو ئاشکرای نەکرد

رووخانی شاو هاتنە سەرکاری خومەینی لە ساڵی ١٩٧٩ لە ئێران ...اوو کارەساتێکی جیۆپۆلتیك بوو، کە تا ئەمڕۆش هەموولایەك لە ...ە ئەنجامەکەیدا دەژین، من ئەو دەمانە وەزیری دەرەوەی بریتانیا ...ووم. ئەو دەمانە پەیوەندییەکانی شاو وڵاتانی ئەوروپی ئاڵۆزو بێ شیرازە بوو، وڵاتەکە لە ناوچەکەدا پێگەیەکی زیندوو بە بەرژەوەندی ئابووری‌و ستراتیژی هەبوو لەگەڵ ئەو وڵاتانەدا، بەڵام ئەو حاکمێکی بە زەبرو کوشندە بوو، ئەگەرچی لە لایەن هێزە کاریگەرەکانی ناوەوە بەرهەڵستی دەکرا، بەڵام ئەو دەیخواست وڵاتەکە بگۆڕێت‌و نوێکاریش پەیڕەو بکات. هەر لە ساڵی ١٩٧٠ەوە دیاربوو ئەگەر بە شێوەیەك لە شێوەکان ریفۆرمی دیموکراسی نەکات، لەوانە پەیڕەوی مەلەکیەتی دەستووری، ئەوا رژێمی شا دووچاری زۆرترین گرفت‌و کێشە دەبێتەوە. دیارە زەحمەتیش بوو هێزە دەرەکییەکان بۆیان نەدەکرا فشار لەسەر شا بکەن، تا ریفۆرمەکەش بکات، لەبەر ئەوەی ئەو کەسێکی لاواز بوو، زۆریش بڕوای بە ئیلتزامەکانی ئەمریکاو بریتانیا نەمابوو، کە بینیی ئەوان دوودڵ بوون لە کۆشش بۆ رووخانی حکومەتەکەی سەرۆك وەزیرانی ئێران محەمەد موسەدەق لە ساڵی ١٩٥٣دا.

## با بردوو

خەڵکێکی زۆر کەم، دەیانزانی شا لە ساڵی ١٩٧٣وە نەخۆشەو نەخۆشییەکەشی کوشندەیە، ئەو دووچاری نەخۆشی کانسەر لە غودەی لیمفاویدا هاتبوو، ئەو نهێنییەش تا ساڵی ١٩٧٩ مایەوە، لەو رۆژەوە نەخۆشییەکەی تەنگی پێ هەڵچنیبوو، گلۆڵەی کەوتبووە لێژی‌و با بردبووی، ئەو لەتاراوگەو لە وڵاتی میسر بەو نەخۆشییە لە رۆژی ٢٧ی یۆلیۆی ساڵی ١٩٨٠ کۆچی دوایی دەکات.

محەمەد رەزا پەهلەوی لە ساڵی ١٩٤١ لە پاش باوکی دەبێتە شای ئەو وڵاتە، ئەوەی کە لە ساڵی ١٩٢٦ وەك پاشایەکی ئەو وڵاتە خۆی ناساندبوو، بەڵام لە سەردەمی شەڕی دووەمی جیهانیدا کە هێزەکانی بریتانی‌و سۆڤیەتی وڵاتەکە داگیردەکەن ئەو واز لە کورسییەکەی دەهێنێت، کە سەرکردەکان رۆزفلت‌و تشرشل‌و ستالین لە ساڵی ١٩٤٣ کۆدەبنەوە، ئەو گەنجێکی نەناسراوبوو، بەڵام سەرسام دەبن کە پاش سی ساڵ ئەو دەبێتە خاوەن هێزێکی مەزن لەو ناوچەیەدا.

## کەسێکی پەککەوتوو

بۆ یەکەمجار کەسایەتی شا بە لاوازی دەرکەوت کە موسەدەق کودەتاییەکی لە ساڵی ١٩٥٣ بەسەردا کردو لەسەر تەخت هێنایە خوارەوە. کە موسەدەق هاتۆتە سەر حکوم پترۆڵی وڵاتەکەی خۆماڵیکردووە، ئەوەش ولایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاو بریتانیای

نیگـەران کردبـوو، بـەرەی دەرەوەی لێهەڵساوەو لـە ناوەوەشـدا نارەزاییـەکی زۆری روو بـە روو دەبێتـەوە، بۆیـە هـەردوو دەزگـای موخابـەراتی ناوەنـدی ئـەمریکیو موخابـەراتی بریتـانی بـە ئاسانی رووخانـدیان. ئـەو دوو حکومەتـەش توانیبوویـان شـا بـەرەو بەرنامـەی ریفۆرمی بهاژۆن، حکومەتە نوێیەکە پەیڕەوی دیموکراسـی راستەقینە بکات، لەودەمانەدا شا لەگەڵ (سورەیا)ی هاوسـەری بە فڕۆکە دەگاتە بەغدا. لـەوێ سـەفیری بریتـانی قسەکانی شـای کـە بـۆ ئەمریکییـەکان کردبـووی بـەبیر دەهێنێتـەوە. ئینجـا ئـەوان ئاکـاری دوارۆژی شـا دادەرێژن، بەو هیوایەی وڵاتەکە خوێنی لەبەر نەڕواتو نەبێتە ئاژاوەو دەستێوەردانی سۆڤیەتییەکان.

## بەرەو رۆما

لـە گەرمـەی روودانـی کودەتایەکـە، شـا هیچـی لەدەسـت نـەمابوو تەنها ئەوە نەبێت را بکـات، بۆیـەش ئـەو بـە فڕۆکەیـەك دەگاتـە رۆمـا، ماوەیەك بێ پارەوپول لە هوتێلدا دەمێنێتـەوەو هـیچ دەسەڵاتیشی بـە سـەر رووداوەکـانی نـاو وڵاتـدا نەدەشـکا، بـەڵام ئەمریکییـەکان وەك حاکمی شەرعی پشتی دەگرن، چونکە ئـەوان وا دەزانـن موسـەدەق بـە کردەوەکـانی ناشـەرعییەتی کردبـوو. لـە نـاو شـەقامەکانی ئێرانیشـدا دۆسـتو هـەوادارانی موسـەدەقو شـیوعییەکانی حیزبـی تـودە دەسووڕانەوە، لەولاشەوە (سی ئـای ئـەی) ی ئـەمریکیش جـەماوەرێکی بـەرینیان بـۆ پشـتیوانی شـا لـە شـەقامەکاندا سـازکردبوو، ئـەوەش

جەماوەرەکەی هاندا پشتیوانی خۆیان بۆ شا دووپات بکەنەوەو سوپاش پشتیوانی کردو لە کودەتاکەی موسەدەق هەڵگەڕانەوە. لە کاتی دادگاییکردنیشیدا موسەدەق وتبووی:

من گلەییم لە بریتانییەکان هەیە. بەڵام قسەی واش هەبوو کەوا ئەمریکییەکان بۆ سەرکەوتنی ئەو کارکەر بوون.

## ساڤاك بۆ داپلۆسین

شا بە گەڕانەوەی بۆ وڵات لە ساڵی ١٩٥٣، وا دەزانرا خۆی بە قەرزاری میللەتەکەی دەزانێت، بەڵام ئەو بۆ خۆپاراستن دەزگایەکی موخابەراتی تایبەتی بە ناوی ساڤاك دادەمەزرێنێت، بۆ سەرکەوتنی ئەو دەزگایەش پشت بە یارمەتیو رێنماییەکانی دەزگای موخابەراتی ئەمریکیو ئیسرائیلی مۆساد دەبەستێت، پاشان ئەو دەزگایە دەبێتە ئالەتێك بۆ داپلۆسینو ئەشکەنجەدانی میللەت. لە مانگی یولیوی ساڵی ١٩٦٢دا شا (ئەسدوڵا عەلام) دەکاتە سەرۆك وەزیران، کە خۆپیشاندان لە ساڵی ١٩٦٣ روو دەدات، بۆ بەر پەرچدانەوەی ئەو هەڵمەتەو کپکردنی نارەزاییەکە ئەو دەبێتە ئالەتێکی بە زەبر، سەرۆك وەزیرانی بە بێ دوودڵی خۆپیشاندەرەکان بە زەبرو زەنگ بێدەنگ دەکاتەوە. سەرەتا شا لەگەڵ ئەوەدا بوو ئایەتوڵا خومەینی لە سێدارە بدات، بەڵام پاشان پەشیمان دەبێتەوەو لە وڵات دەری دەکات، خومەینی روو لە تورکیا دەکات، پاشان دەچێتە عێراق. سەرەتا خۆرئاواییەکان بەتایبەتی ئەمریکییەکان شا بە پۆلیسی خۆیان دەزانن لە کەنداو، بەڵام ئەو

گەمـەی دەسـتی ئـەوان نـەبوو، یـان چـرپنووکی دەسـتی ویلایەتـە یەکگرتووەکانی ئەمریکاش نەبوو، ئەوان دەیانویست پشتیوانی بکەن تا مەملەکەتەکەی بەرەو دیموکراسییەت بیات.

## پاش مردنی نهێنییەکانی دەزانرێت

ئەفینە نەمرەکە، کتێبێکە لـە نووسینی شاژن فـەرەح پەهلـەوی، ئەو لەو کتێبەدا هەموو وردەکاری نەخۆشییەکەی شا ئاشکرا دەکات، تـا سـالّی ٢٠٠٤ سـالّی دەرچـوونی ئـەو بیرەوەرییـە چـیرۆکی راسـتی نەخۆشییەکەی ئەو زانرا. فەرەح پەهلەوی ئامـاژە بـە دوو نامـە دەدات کە دکتۆر (فلانـدرین) ئاراستەی پروفیسـۆر (جـین بیرنـارد)ی کـردووە، ئـەو دوو کەسـە هـەردووکیان فەرەنسـی بـوون، سەرپەرشـتی چارەسـەرکردنی شـای نەخۆشـیان دەکـرد، فلانـدرین تـا مردنـی شـا بەردەوام بووە، هـەردوو نامەکـە لـە سـالّی ١٩٨٧ەوە نووسـراوە، بـاس لـە وردەکـاری نەخۆشـییەکەو رەوشـی تەندروسـتی دەکـەن. راوێـژکاری شـا دکتۆر (عەباس سافافیان) پەیوەندی کرد بـە (بیرنـارد)ەوە لـە پـاریس، داوای لێکرد ئەو بگاتە تاران، ئەودەمانە بیرنارد بەڕێوەبەری ئامۆژگەی توێژینـەوەکانی لۆشـیمیا بـوو لـە نەخۆشـخانەی سـانت ئـەتییان لـە پـاریس، ئـەو پسـپۆڕێکی زۆر شـارەزابوو لـە نەخۆشـییەکانی خـوێن، هەروەها دکتـۆری تایبـەتی سـەرۆك جـۆرج بومبیـدۆش بـوو، سـافافیان دلّنیابوو ئەو دەتوانێ نهێنی نەخۆشییەکەی شـا بپارێزێـت، ئـەو داوای لـەو دوو دکتـۆرە فەرەنسـییە کردبـوو بـە هـەموو کەرەسـتەو

پێداویستییەکانیانەوە بگەنە تاران‌و لەسەر سەری شا ئامادەبن، پاش ئەوەی ئەو دوو دکتۆرە هەموو مەوعیدەکانیان هەڵدەوەشێننەوەو لە دوای دوو رۆژ دەگەنە تاران، ئەو رۆژە رێکەوتی ١ ی مایۆی ساڵی ١٩٧٤ بوو. کە فڕۆکە ئێیرفرانسەکە لە فڕۆکەخانەی میهرباد دەنیشێتەوە دوو ئوتومبێلی چرا داگیرساو چاوەڕوانی دوو میوانەکەیان دەکرد، لەوێ دەگەنە باڵەخانەیەکی حکومی‌و سافافیان چاوەڕوانی دەکردن، ئەویش لە پاریس پزیشکیی خوێندبوو، لەگەڵ فلاندرین رۆژێك لە رۆژان پەیوەندی خوێندن‌و کاریان هەبووە، بۆیەش بەیەك ئاشنابوون.

## کێ نەخۆشە...؟

لە هوتێل هلتۆن تاران سافافیان بە دوو دکتۆرەکە دەڵێت، کەوا وەزیری بەلات ئەسدولا عەلام نەخۆشە، بەڵام بیرنارد گومان لەو قسەیە دەکات، بە هاوڕێیە دکتۆرەکەی دەڵێت، من وا دەزانم نەخۆشەکە لە ئەسدوڵا گەورەترە. کە دوو دکتۆرەکە چاویان بە وەزیری بەلات دەکەوێت، ئەو پێیان دەڵێت، ئێوە بانگکراون بۆ چارەسەری شاکەمان کە نەخۆشە. کە شا بۆ یەکەمجار دوو دکتۆرەکە دەبینێت بە زمانێکی فەرەنسی زۆر باش قسەیان لەگەڵدا دەکات. لەو دیمانەیەدا کەسێك بە جلی سەربازی لە تەنیشتیان دانیشتبوو، کەسەکە (عەیادی) بوو کە دکتۆرە سەربازییەکەی ئەو بوو، پلە سەربازییەکەشی ژەنراڵ بوو.

هەموویان لەسەر مێزێك دادەنیشن، شا باس لە وردەکاری

نەخۆشییەکەی خۆی دەکات، لەوێ دەڵێت:

من پێش چەند مانگێك و لە کۆتایی ساڵی ۱۹۷۳ دا، ئەودەمانەی لە دوورگەی کیش بووم، زانیم کەوا لە لای خوارەوەی لاچەپی قەفەسی سینگم بۆشاییەك هەیە، وتیان رەنگە ئەوە ئەستووربوونی سپڵ بێت، کە پشکنینی بۆ کرا رێك مەزندەکە راست بوو، هەوکردنەکە لە سپڵدا بووە نەك لە غودەی لیمفاوی.

لەم دەمانە شا تەمەنی ٥٥ ساڵ بوو. هەردوو دکتۆرەکە نموونەیان لە جەستەی ئەو لەگەڵ خۆیاندا بردو کاریان لەسەر کردبوو، بۆیان دەرکەوت کەوا ئەو نەخۆشی غودەی لیمفاوی هەیە، کە قسەکەیان بە عەبادی وتبوو، ئەو وتبووی، دەستەواژەی لوشیمیا بەکاربهێنن، داوای کردبوو، ئەو ئەنجامە بەو نەڵێن، بە شا بڵێن تەندروستی زۆر باشەو هیچ مەترسی لەسەر ژیانی نییە. ئەو قسەیەی عەبادی بە دڵی دوو دکتۆرەکە نەبوو، وتبوویان ئێمە کار دەکەین، بۆ چارەسەرکردنەکەش کۆشش دەکەین، بەڵام ناکرێ راستییەکە بەو نەڵێین، دەبێ مەسەلەکەی باش بۆ روون بکەینەوە. سەرەتا دکتۆرەکان لە نەخۆشییەکەی شا نیگەران نەبوون، هەردوو دکتۆرەکە وتیان ئێمە دەگەڕێنەوە پاریس کە ئەنجامی وردی پشکنینەکانمان تەواو کرد، ئەوا ئەنجامەکە رادەگەیەنین، دەرکەوت شا نەخۆشەو ناوێکیان بۆ نەخۆشییەکەی دۆزییەوەو ناویان نا نەخۆشی (والدنستروم) بەڵام ئەوان زۆریش لە ناوەکە رازی نەبوون، واتە قەناعەتیان بەو ناوە نەهێنابوو.

کە هەردوو دکتۆرەکە لەناو کۆشکی شا دەردەچن، دوو بۆچوونی

جیاوازیـان لەسـەر ڕەوشـی تەندروسـتی ئـەو دەبێـت، بۆیـەش بیرنـارد وایـدەزانی ئێرانییـەکان ئـەوان بـە دکتـۆری ئـەمریکی دەگـۆڕن، بـەڵام ئەوەیان ڕاست نەبوو، دیارە ئـەوەش مەبەسـتی تایبـەتی شـا خـۆی بـوو کەوا حەزی نەدەکرد ئەمریکییەکان بزانن ئەو نەخۆشەو نەیدەویست ئــەوان ئاگـاداری وردەکـاری تەنـدروسـتی ئــەو بــن، بۆیــەش دکتــۆرە فەرەنسییەکانی لا باشتربوو. ئەگەر ئەمریکییەکان بیانزانیبووایـە ئـەو نەخۆشە، ئـەوە کاردانـەوەی سیاسـی بـۆ دەکـرا، هـەروەها سـەبارەت بـە بریتانیاش هەمان بۆچوونیان هەبوو. هەردوو دکتۆر بـاش لـەوە حـاڵی بـوون کـەوا شـاو عـەلام کاریـان بـۆ ئـەوە کردبـوو کـەوا کۆشـش بکـەن نهێنییەکانی ئـەو بپارێزن، هـەواڵی نەخۆشییەکە لـەو بازنـە نەچێتە دەرەوە.

## پێنج کەس

دوو دکتۆرە فەرەنسییەکەو ژەنراڵ عەبادیو شاو ئەسدوڵا عـەلام، ئاگاداری وردەکاری نەخۆشییەکەی شـاو قۆناغـەکانی چارەسـەرییەکان بوون، سەرەتا تەنها ئەو پێنج کەسـە لـە هەمـوو شـتەکان ئاگـاداربوون. سافافیان بیری لـەوە نـەدەکردەوە لەگـەڵ عـەلام پێشبڕکێ بکـات، بـەڵام دوو دکتۆرە فەرەنسییەکە سووربوون لەسەرئەوەی ئەگەر سـافافیان لـە نـاو بازنەکـەدا بێـت ئـەوان لـە چارەسـەرکردنەکە دەسـت دەکێشـنەوە، نەیاندەویست ئەو لە ناو وێنەکەدا بێت.

لــە مــایۆی ســاڵی ١٩٧٤ لــە ڕاســتیی نەخۆشــییەکە، شــایان

ئاگادارکردەوە، بەڵام نەیاندەویست مەسەلەکان لە تەلەفۆندا باس بکەن، بۆیەش لە نەخۆشخانەی ئەمریکی لە پاریس سەردانی ئەو دەکەن، بەوەشیان ئەو دەبێتە کەسی ژمارە شەش لەوانەی لە نەخۆشییەکەی شا ئاگادار بن. تێستە تایبەتییەکانی خوێنەکەی بە ناوی یەکێك لە خزمەکانی فلاندرینەوە لە پاریس کرابوو. دوو دکتۆرەکە ئەنجامەکانی تێستەکە دەبەنە پێش سافافیان، ئەو تا مانگی سێپتەمبەری ساڵی ١٩٧٤ هیچ قسەیەکی نەکردبوو، بۆیەش لە رۆژی ١٨ ی ئەو مانگە داوا دەکات بچێتە تاران. لەودەمانەو لە رۆژانی نێوان ٢٤ تا ٢٩ ی یۆنیۆ شاو شابانو بە یەکەوە بۆ پیرۆزبایی سەرۆکی نوێی هەڵبژێردراو (ڤالیری جیسکار دیستان) لە پاریس دەبن، هاتنەکەی ئەو هیچ پەیوەندی بە تێستی خوێنو نەخۆشییەوە نەبوو، لەو رۆژانەش شا بە هیچ شێوەیەك پەیوەندی بە دکتۆرەکانیەوە نەکردبوو. بۆ جاری دووەم هەردوو دکتۆرە فەرەنسییەکە دەگەنە تاران، دکتۆرێکی تر بە ناوی میلیز لەو رۆژانە دەگەنە ناو بازنە تەسکەکەی نەخۆشییەکەی ئەوو ئەوانەی دەزانن کەوا شا نەخۆشە. سافافیان وتبووی دەبێ میلیزیش بەشداری ئەو نهێنییە بێت، چونکە ئەومیان مەعقول نییە، ئەو پێشتر چارەسەری هەر یەك لە سەرۆکەکان شارل دیگۆڵو یەکێك لە پاشا سعودییەکانی کردووە، هەستدەکرا ئەو دەتوانێت نهێنییەکە راگرێت، بەو کەسەش ژمارەکە گەیشتۆتە حەوت کەس، کەسی ژمارە هەشتیش ئەو کەسە بوو کە دەیزانی شا لەلایەن دکتۆرە فەرەنسییەکان چارەسەر دەکرێت، بەڵام نەیدەزانی نەخۆشییەکەی شا چییە.

## نهێنییەك هەبوو شا خۆیشی نەیدەزانی

بۆ دۆزینەوەی رێگاچارەیەك بۆ مەسەلەی نەخۆشییەکە شاو پاش دووەم راوێژکارییەکە لەو بارەیەوە، هەر یەك لە بیرناردو فلاندرین‌و میلیزو سافافیان لە کۆشکی ئیمپراتۆریەت کۆبوونەوە، سافافیان سووربوو لەسەرئەوەی مەسەلەکە زۆر بەنهێنی بمینێتەوە، هەتا شاش لە هەندێ شتیش ئاگادار نەبێت، نەوەك شاش خۆی باس لە نەخۆشییەکەی خۆی بۆ کەسە نزیکەکانی بکات. ئەوەی لە ئاکارو رەوشی ئەو بەدی دەکرا، شا تەندروستی باش دیاربوو، بەلاَم سپڵەکەی ئەستوور دەبوو، دکتۆرەکان بڕیاریاندا بە شێوە کلاسیکییەکە چارەسەری کانسەری غودە لیمفاوییەکانی بکەن، مانگانەش خوێنەکەی تێست بکەن.

پێش ئەوەی عەیادی فەرمان بدات خوێنەکەی تێست بکەن، ئەو هەفتەی یەکەم چارەسەری وەرگرت، بەلاَم ماوەی هەفتەیەك بۆ ئەو حاڵەتە زۆر کەم بوو، لە تێستەکەدا دەرکەوتبوو کەوا ژمارەی خڕۆکەی سپی خوێنی کەم بووەتەوە، ئەوەش هەموولایەکی ترساندبوو، بۆیە بەرنامەی چارەسەرییەکەیان راگرتبوو، داوا کرابوو بۆ جاری سێیەم دکتۆرە فەرەنسییەکان چاویان بە شا بکەوێتەوە.

بۆ ئەو دیمانەیە رۆژی ١٨ی یەنایەری ساڵی ١٩٧٥ دانرابوو، دیمانەو پشکنینەکە لە زیورخ بوو، شا لە گەشت‌و سەیرانی خلیسکانێی سەر بەفربوو، لەوێ دوو دکتۆرەکە تێگەیشتبوون کەوا شا چارەسەرییەکە وەرناگرێت، ئەو رێنماییەش بە ئاگاداری عەیادی‌و سافافیان‌و میلیزو بیرناردو فلاندرین بووە، فلاندرین زۆر هەستی بە ترس کردبوو، کە

زانیبووی رەوشی تەندروستی بەرەو خراپبوون و ترسناکی دەچێت، بڕیار دەدەن چارەسەرکردنەکەی بە وەرگرتنی دەرمانی (CHLORAMBUCIL) بێت، کە لەسەرەتاوە لەلایەن ئێرانییەکانەوە بۆی دانرابوو. تا مەسەلەکە نەزانرێت و هەواڵەکە لە ناو ئێران بڵاونەبێتەوە سافافیان بۆ بەردەوامی تێستی خوێنی شا داوای کرد، کەوا فلاندرین بێتە زیورخ لەوێ تێستەکانی بۆ بکات، چونکە شا یەك مانگ لەوێ دەمینێتەوە. فلاندرین دووبارە لە ١٩ ی فبرایر بۆ تێستی خوێنەکە گەڕایەوە تاران، ئەوەشی بە بەردەوامی دەکرد، هەندێ جار لەو سەفەرانەدا بیرناردیشی لەگەڵدابوو ، ئەگەرنا هەر بەتەنها دەهات و کارەکانی خۆی بەنهێنی ئەنجام دەدا، دوا گەشتیشی بۆ تاران لە کۆتایی مانگی دیسمبەری ساڵی ١٩٧٨ بوو.

## نەخۆشییەکە ترسناك دەبێت

لە نێوان مانگی یەنایەرەوە تا مانگی دیسمبەری ساڵی ١٩٧٥ سپڵەکەی شا هێندەی جارانی ئاسایی خۆی لێدێتەوە، ئەگەرچی رەوشەکە بەرەو باشیش دەڕۆیشت، بەڵام ئەو بەردەوام چارەسەرییەکانی ئاسایی خۆی وەردەگرت. لە مانگی فبرایری ساڵی ١٩٧٩ دا فلاندرین بە سەرسامییەوە هەستیکرد کەوا سپڵی دووبارە ئەستوور دەبێتەوەو هەستی بە پەیدابوونی حاڵەتێکی ناسروشتی لەناو خوێندا کردبوو، واش هەستدەکات نەخۆشییەکەی پەلی هاویشتووەو تەشەنەی کردووە، بۆیە دەخوازێت چارەسەرکردنەکە چڕتر بکرێت،

باشیش دەزانێت کەوا ئەوەیان ئاگادارکردنەوەیەکی درۆ نییە، ئەوان لە سەرەتاوە بڕیاریان دابوو ناوی راستەقینەی دەرمانەکە نەڵێن، دەرمانەکەیان لە ناو کارتۆنی ترو قاڵبی تریاندا دادەنا، واتە دەرمانی CHLORAMBUCIL لەناو کارتۆنی QUINERCYL دادەنا، فلاندرین دەرمانەکەی لە پاریس دەکڕی، بە ناوە دووەمەکەیەوە دەیهێنایە تاران.

## بارێکی گران

سافافیان تاکە ئێرانی بوو هەموو وردەکاری نەخۆشییەکەی شای دەزانی، چونکە دوو کەسەکەی تر عەلام و عەیادی راستی نەخۆشییەکەیان نەدەزانی، ئەوەش بۆ سافافیان ئاسان نەبوو، چونکە بنەماڵەی شا لە دوارۆژا گلەییان دەبوو ئەگەر قسە راستەکەیان پێ نەڵێت، شاردنەوەی ئەو نهێنییەش مەترسیو رەنگدانەوەی سیاسی دەخولقاند، پاش ئەوەی دووجار لەگەڵ دکتۆرە فەرەنسییەکان قسەی کردبوو، بڕیاردەدەن راستییەکە بە هاوسەرەکەی بڵێن، ئەوان مەبەستیان بوو ژنەکەی ئامادەیی هەبێت، چونکە نەخۆشییەکەی تەشەنەی دەکرد، سەرەتا بە شایان وت، کەوا خۆت باسی مەسەلەی نەخۆشییەکەت لەگەڵ شابانو بکە راستییەکەی پێ بڵێ. بەڵام ئەو هەموو جارێك ئەوەی پێ نەدەکرا، بۆیەش دکتۆرەکان بڕیار دەدەن بە شێوەیەکی نهێنی ئەوە بە ژنەکەی بڵێن. بیرناردو میلیو سافافیان و کلاندرین لە پاریس ژنەکە دەبینن و راستی نەخۆشییەکەی شای پێ دەڵێن، ئەوەش دیارە ئاسان نەبوو، چونکە پیاوەکە لە ئاکاری هیچ دیار

نەبوو، بەلام لە راستییدا ئەو نەخۆشییەکی ترسناکی لە خوێندا هەبوو، ئەوەی جێگای باسە، شا هەموو وردەکاری نەخۆشییەکەی دەزانی، بەلام ئامادەش نەبوو هیچ بە ژنەکەی بلێت.

## ژنەکەی دەزانێت

شاژن بە مێردەکەی دەلێت کەوا مەسەلەکەیان پێ وتووەو راستییەکەشی زانیوە، دەیویست بوار لە شا وەرگرێت، شاژن خۆی لەگەڵ دوو دکتۆرە فەرەنسییەکە قسە بکات، بێ ئەوەی شا بزانێت ئەو بەنهێنی هەردوو دکتۆرەکەی دیوە.

کە دوو دکتۆرەکە دەگەڕێنەوە تاران، شاژن داوا دەکات بیانبینێت، بەوەش کەسێکی تر دەزانێت کەوا شا نەخۆشە. پاش مانگی ئۆکتۆبەری ساڵی ١٩٧٩ پێش ئەوەی بچێتە نیویۆرکو بچێتە مەکسیکو دوورگەی باهاما، خەلکێکی زۆر دەیانزانی ئەو نەخۆشە.

من لە ساڵی ٢٠٠٥ دووجار دیمانەم لەگەڵ سافافیان بووە تا باسی نەخۆشییەکەی شام بۆ بکات. ئەوەی جێگەی باس بووە شاو شاژن بڕوایان بە دکتۆرەکان هەبووە کە لەو ماوەیەدا نهێنییەکەیان پاراستووە، ئەگەرچی شوێنەکەیان زۆریش ناناسایی بووە. دکتۆر بنیامین کین، کە دکتۆرێکی ئەمریکی بوو، ئەوەی پاشان هاتووتە ناو تیمەکە وتبووی:

شا لە ساڵی ١٩٧٤ قبووڵی نەکردووە نموونەی خوێنەکەی تێست بکەن، بەلام هەردوو دکتۆرە فەرەنسییەکە ئەو قسەیەی ئەو رەفز

دەکەنەوە. ئەوان دەڵێن پەیوەندی شا بە دکتۆرەکانەوە زۆر رەسمی بووەو بەرێزو شکۆوە مامەڵەی لەگەڵدا کردوون، ئەو هەرگیز بەو شێوەیە قسەی لەگەڵ دکتۆرەکان نەکردووە.

# بەشی سێیەم

## شا بەرنامەی وابوو تا ساڵی ١٩٨٣ لە دەسەڵات بمێنێتەوە

هاوسەری شای ئێران بەو جۆرە باسی رەوشی تەندروستی مێردەکەی بۆ سەرۆکی فەرەنسی جیسکار دیستان کردووە:

ئەو وایدەزانی کێشەکە لەوەدایە ئەو کاتی کەمە، ئەو زۆر لە دەسەڵات نامێنێتەوە، ئەو دەیەوێت تەنها حەوت هەشت ساڵی تر بمێنێتەوە، ئەودەمانە تەمەنی دەگاتە شێست ساڵێك، حەزی دەکرد زوو بڕوات، بەڵام کوڕەکەمان هێشتا گچکەیە، ئەو چاوەڕوانی دەکرد دەسەڵاتەکە بداتە ئەو، ئەو بە پەلە بوو، تا مەسەلە سیاسییەکان بۆ ئەو ئامادە بکاتو ئینجا ئەو بڕوا، ئەگەرنا لە سەرەتاوە ئەو کێشەو کۆسپی زۆری دێتە پێش. ئەو دەیووت ئەرکی گۆڕانی ئێران لەسەر شانی من دایە، دەمەوێ ئەومیان بکەم.

## پشتگوێخستنی باری تەندروستی

بەڵام وردەکاری رەوشی تەندروستی ئەو لەگەڵ بەرنامەو پلانەکانی دەسەڵاتەکەی تەریب نەبوو، تا لە نێوان ساڵانی ١٩٨١ یان ١٩٨٢ تاجەکەی بداتە کوڕەکەی، ئەودەمانە ئاگاداری تەندروستی نەبوو، شاهبانۆ وتبووی، من بڕوا ناکەم ئەو هیچ زانیاری لەسەر تەندروستی خۆی هەبوو بێت، کە ئەو قسانەی کردبوو نەیدەزانی تەندروستی چۆنە.

لە چەندین بۆنەدا بیرنارد ویستبووی لەسەر تەندروستی ئەو قسە لەگەڵ شا بکات، ئەویش لە کۆشکی هاوینەی خۆیدا لە ساڵی ١٩٧٨ وتبووی:

من تەندروستیم زۆر باشە، لەوەشیان دڵنیام کە زۆر باشم.

لەودەمانەشدا کوڕەکەی ئەو لە کولێژی فڕۆکەوانی ئەمریکی پرۆڤەی دەکرد. شا بە فلاندرینی وتبوو:

من داواکارم بۆ ماوەی دوو ساڵ چاودێری رەوشی تەندروستیم بکە، تەنها دوو ساڵ، تا کوڕەکەم نیمساڵ خوێندنەکەی تەواو دەکات، ساڵێکیش لە تاران بمینێتەوە.

## ریفۆرمەکە زۆر دوا دەکەوێت

لە ساڵی ۲۰۰۵ دیمانەیەکی دوورودرێژم لەگەڵ فەرەح پەهلەوی کردبوو، لەوێ ئەو وتی:

کە هاوسەرەکەم لە رەوشی تەندروستی خۆی تێگەیشتبوو، کۆششی دەکرد کوڕەکەی بۆ دەسەڵات ئامادە بکات، بۆ ئەوەش چەند پرۆسەیەکی ریفۆرمی بۆ سازکردنی دیموکراسیش کردبوو. چونکە باش دەیزانی دەسەڵاتی ئەو رۆژانەی وڵاتەکەی بەو کوڕە گەنجە زەحمەتەو نەستەنگی زۆری دێتە پێش.

شا تا لە ژیاندا مابوو، دەیتوانی کۆمەڵێك ریفۆرم بکات، من وەك وەزیری دەرەوەی بریتانیاو لەگەڵ وەزیری دەرەوەی ئەمریکی سایروس ڤانس دەمانزانی شا نەخۆشە، ئێمە لە رۆژی ١٤ ی مایۆی ساڵی ١٩٧٧ بۆ بەشداریکردنمان لە کۆنگرەی ئاسایش و هاوکاری ئەوروپی بەیەکەوە بووین، دەمانزانی ئەو نەخۆشەو لەوێش پێمان وت:

وا چاکە ریفۆرمێك لە ولاتا بکات، پەیرەوی دیموکراسی ئەوروپی بکات تا پاشایەتی دەستووری بۆ کورەکەی جێبهێڵێت، من ئامۆژگاریم کرد ئەزموونەکەی ولاتی ئیسپانیا پەیرەو بکات. لەوێ ژەنەراڵ فرانکۆ مەلیك خوان کارلۆسی وەك پاشایەکی دەستووری دانابوو، ئەوەش دیموکراسی راستەقینەبوو، دەگرا ئەو ئەزموونەش لە ئێران کۆپی کرابووایە. دەبووایە ئەمریکاو بریتانیا شا رازی بکەن چەند هەنگاوێك لەو ریفۆرمە بچێتە پێشەوەو خشتەیەکی زەمەنی بۆ گواستنەوەی بەرەو پاشایەتی دەستووری بڕوات، چونکە ئەو نەخۆشەو کاتەکەش ناسکە، بەداخەوە کارەکان دەکرا، بەڵام ئەویش بۆی نەکرا.

لە نۆڤەمبەری ساڵی ١٩٧٣ەوە شا دەیزانی جەرگی ئەستوور بووە، بۆیەش بڕیاریدابوو ئەنجومەنێکی راوێژکاری دامەزرێنێت، هەموو دەسەڵاتەکانیش لە بن دەستی ژنەکەی دەبێت تا کورەکەی تەمەنی دەگاتە ئاستی یاسایی کە تاجەکەی باوکی وەرگرێت. لە ساڵانی ١٩٧٧و ١٩٧٨دا کێشەکانی ناو ولات زۆرتر دەبێتو نارەزاییەکان ئەستوور دەبن، دەبووایە شا بچێتە دەرەوەو دکتۆرێکی پسپۆڕ ببینێت، دیارە ئەوەش مانای ئەوەبوو کە تەندروستی خراپەو زێدەڕۆییشە ئەگەر بەو جۆرە بمێنێتەوە، بۆیەش دەبوایە زۆر خێرا ئەنجومەنی راوێژکاری بۆ ریفۆرمی سیاسی دامەزرێنێت، لەودەمانە دوورکەوتنی ئەوو ئەگەری گواستنەوەی سیاسی، بە شێوەیەکی ئاشتیانە، بوار ساز دەبوو سیستەمی پاشایەتی دەستووری بێتە ئاراوە.

## شەقام بڵێسەی گرتبوو

بەپێچەوانەوە باسی نەخۆشییەکەی شا نەدەکرا، دۆستە خۆرئاواییەکانی باسیان نەدەکرد، کە لە تاران کۆنفراسەکە کرا باسی ئەو مەسەلە نهێنییەیان نەکرد، ئەگەرچی هەموویان لەسەر خوانەکەی ئەو دانیشتن و داوەتی ئەویش بوون.

ڕووداوەکان لە ساڵی ١٩٧٨ زۆر خێرا گەشەی دەکرد، خۆپیشاندانەکان زۆربوون، نارەزاییەکان لە شاری قوم گەیشتە ئاستێکی بەرز، لەوێ چەند کەس لەناوچوون، بڵێسەی ڕووداوەکە گەیشتە شارەکانی تاران و تەبریزو شارەکانی تر، لە مانگی مایۆی ساڵی ١٩٧٩ ئاگرەکە خۆش بوو. شا سەرۆکی دەزگای ساڤاك ژەنراڵ نیعمەتوڵا ناسری گۆڕی. لە کۆتایی مانگی یۆلیۆدا خۆپیشاندانەکان گەیشتە شاری مەشهەد، لە شاری ئەسفەهانیش حاڵەتی ئامادەباشییان ڕاگەیاندبوو، لەودەمانەداو لەگەڵ ئەو پێشهاتە ترسناك و خێرایانە شا بەڵێنی زۆرتر ریفۆرم و چاکسازی دەدا، دەیووت هەڵبژاردنی داهاتووی مانگی یونیۆی ساڵی ١٩٧٩ ئازاد دەبێت، هەموو ئازادییەکانی.ڕادەربڕینیش فەراهەم دەکەین، بەڵام ژمارەی ئەوانەی بڕوایان بە بەڵێن و قسەکانی دەکرد کەم و دەگمەن بوون. ئەگەر حکومەتە خۆرئاواییەکان دەیانزانی شا نەخۆشەو تەندروستی خراپە فشاریان لێدەکرد، کە واز لە دەسەڵات بهێنێت. چونکە ئەو بە بێ ئەو فشارانە دەستبەرداری تاجەکەی نەدەبوو، حکومەتی بریتانیا گازی فرمێسك پڕژێنی دەدایێ، ئەگەرچی سەفارەتی بریتانیا لەگەڵ بەخشینی ئەو گازە نەبوو بۆ کپکردنی خۆپیشاندەرەکان، سەفیری بریتانیای ئەو ڕۆژانە (ولیام سولیفان)و

وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکاش دژی هاوکارییەکەی بریتانیابوون، بەڵام ڕاوێژکاری کارتر بۆ کاروباری ئاسایشی نەتەوەیی (زیگنیو بریجنسکی) لەگەڵ هاوکارییەکەی بریتانیابوو.

## کشانەوەی دکتۆرە تایبەتییەکە

ڕەوشی سیاسی ئێران بەرەو شپرزەیی و ئاڵۆزی دەچوو، دکتۆرەکانیش بەرپرس بوون لەوەی حکومەتەکانی خۆرئاوایان ئاگادار نەکردەوە کەوا تەندروستی شا خراپە، ئەوان دەیانتوانی دیمەنی ڕوونی ئێران وەك خۆی بەرجەستە بکەن، ئەوان باش دەیانزانی شا لە چ وەزعێکدایە بە چاوی خۆیان ڕۆژمڤی شەقامەکانی تارانیان لێوە دیاربوو، دیارە کەسێکی نەخۆشیش ئاسان نەبوو ئەو مەسەلانە چارەسەر بکات، لەودەمانەش دکتۆرە تایبەتییەکەی ئەو گەڕایەوە فەرەنساو نەخۆشەکەی لە تاران جێدەهێڵێت و ئامادەش نەبوو ڕاستی نەخۆشییەکەی شاش بە کەس بڵێت.

## نائومێدی و شپرزەیی

دوا سەفەری دکتۆر (فلاندرین) بۆ تاران لە مانگی دیسەمبەری ساڵی ١٩٧٨ بوو، ئەو ٣٩ جار شای نەخۆشی دیبوو، لەوانە ٣٥ جاریان لەناو ئێران بووە، لەودەمانەدا سەرەتای ڕەوشێکی زۆر نیگەرانی و

نائومێدی له شا به دەردەکەوت، هەتا له کاتی سەردانی دکتۆرەکانو چارەسەرییەکانیش تاقەتی ئەوەی نەمابوو بە پێوە راوەستێتو گوێ له رادیۆش بگرێت.

پرسیاریش ئەوەبوو، ئایا ئەو دەمانە دکتۆرەکان راستی نەخۆشییەکەی شایان به میللەتی ئێران راگەیاندبوو...؟

ئایا دەبوایه دکتۆره فەرەنسییەکان رەوشی تەندروستی ئەویان بە سەرۆك جیسکار دیستان گوتبووایه...؟

مەترسییەکان لەسەر ولاتی ئێران زۆر ترسناك بوو، نەدەبوایه دوو دکتۆری پیشەیی وەك سیاسییەك هەڵسوکەوتیان بکردایه، ئەوان رەچاوی باشی چییان بۆ نەخۆشەکەیان هەبوو...؟ خراپەکان چی بوون ...؟ چ له بەرژەوەندی ئەو دابوو، کە بەو جۆره دەجولانەوە، هیچ ئینساف نەبوو، دکتۆرەکان ئەو مەسەلەیان له گۆشەیەکی سیاسییەوە سەیر بکردایه...؟

دیاره کەوا دکتۆره ئیرانییەکان ئەومیان لەدەست نەدەهات، بەلام بۆ دکتۆره فەرەنسییەکان ئەومیان ئاسانتربوو، دکتۆر فلاندرین به منی وت:

کەوا ئەو مەسەلەیەی بە حکومەتەکەی خۆی رانەگەیاندبوو، بەلام نازانم پرۆفیسۆر بیرنارد، یان پرۆفیسۆر میلیز، ئەو زانیارییەیان به سەرۆك دیستان گوتبوو، یان نا...؟

له هەموو لایەکەوە وەزعەکه ئالۆزبوو. رەوشەکەش ئالۆزتر دەبوو ئەگەر هەمان حالەت له لەندەن بوایه یان له واشنتۆن. ئەودەمانە پاریس ئارەزوومەندبوو شا پەیوەندی بە خومەینییەوه بکات، کە له

پــاریس دەژیــا، رەنگــە دوو دکتــۆرە فەرەنســییەکەی چارەســەری نەخۆشیەکەی ئـەویان دەکـرد درکیـان بـەوە نـەکردبێت، ئەگـەر ئـەوان سـەرۆك دیسـتانیان ئاگـادار کردبوایـە کـەوا شـا نەخۆشـەو رەوشـی تەندروستی ترسناکە، خزمەتی نەتەوەییان بە فەرەنسا دەگەیاند.

ولیام شوکروس لە شاکارەکەیدا (دوا گەشتەکەی شا) نووسیویەتی:

دڵنیــام کــەوا هــەواڵگری فەرەنســا بــە نەخۆشــییەکەی شــایان نەدەزانی، راستییەکەش وابوو، هەردوو دەزگای هەواڵگری فەرەنسیو ئـەمریکی نەیانـدەزانی کەوا شـا نەخۆشـە، ئـەو نووسـیویەتی مۆسـادو ساڤاكو هەواڵگری بریتانیش نەیاندەزانی کەوا ئەو نەخۆشە.

## تەنها پڕوپاگەندەیە

یـەکێك لـە دبلۆماتـە سۆڤیەتییەکان کـە زۆرجـار لەگـەڵ هـاوڕێ ئەمریکییەکەی بەیەکەوە ئێواران لە یەکێك لە رێستورانتەکانی تـاران نانیان دەخـوارد، ئاگـاداری هـاوڕێ ئەمریکییەکـەی کردۆتـەوە کـەوا شـا نەخۆشی کانسەری هەیـە، بـەڵام دبلۆماتـە ئەمریکییەکە قسەکەی بـە پڕوپاگەندەیەکی سۆڤیەتی زانیبوو. لەسەردەمی بلسن کە نهێنییەکانی تۆمـاری هـەواڵگری سـۆڤیەتی بڵاوکرایـەوەو ئاشـکرا بـوون، دەرکـەوت دەزگاکە لەو پڕوپاگەندەیە دڵنیا نەبووە. کە من لە کۆتاییەکـەی سـاڵی ١٩٧٨ دیمانـەم لەگـەڵ وەزیـری دەرەوەی سـۆڤیەتی (ئەنـدریـە گرومیکـۆ) هەبوو، بەیەکەوە باسی رەوشی ئێرانمان کـرد، ئـەو بـە هـیچ شـێوەیەك ئامــاژەی بــە نەخۆشــییەکەی شــا نــەداوە، هــەروەها لــە تۆمــارو

ئەرشیفەکانی هەواڵگری ئەڵمانیای خۆرهەڵاتیش بابەتێك بۆ پشتگیریی ئەو مەسەلەیە نەدۆزراوەتەوە، بەڵام هەواڵگری ئەڵمانیای خۆرئاوا ئەوەی زانیوەو ئاگاداری لەندەن و واشنتۆنی کردۆتەوە کەوا شای ئێران نەخۆشەو تەندروستیشی خراپە.

لە کۆتایی ساڵی ١٩٧٩ وەزیری دەرەوەی فەرەنسا لویس گیرنگاد، کە هەردووکمان لە دەرەوەی دەسەڵاتدا بووین، لەوێ و ئەو کاتانە ئەو بە منی وت، کەوا شا نەخۆشەو ساڵێکە ئەو نەخۆشییەی هەیە، منیش وتم، ئەوەیان راست نییەو ئەو هەواڵە هەڵبەستراوە، چونکە بڕوا ناکەم ئەوەیان لەسەر کەسێکی دکتۆر تێپەڕێت و لەبیری بکات. ئەو وتی:

حکومەتەکەمان لە هاوینی ساڵی ١٩٧٨ ەوە زانیویەتی کەوا ئەو نەخۆشە. دیارە کەوا ئەو پیاوەی کە دۆستایەتییەکی باشمان بەیەکەوە هەبوو، قسەکەی راست دەرچوو. ئەوەی جێگەی باسە کەوا سەفیری پێشووی بریتانیا لە تاران سیر (دینیس راتب) لە دیمانەیەکدا لە (بی بی سی) داو پاش ئەوەی خانەنشین کرابوو، وتبووی من هەواڵێکم زانیوە کەوا شای ئێران نەخۆشەو نەخۆشییەکەشی ترسناکە، بەڵام من لەو دەمانەدا کە قسەکەم زانیبوو سەردانی شام کرد، بینیم تەندروستی زۆر باشەو هیچ شوێنەواری ناساغی پێوە نییە. پاش ماوەیەکی زۆر لە مانەوەی لە پۆستەکەی لە یەکێك لە بۆنەکاندا لە سەرۆك دیستانیان پرسیبوو، ئایا تۆ هیچ زانیارییەکت لەسەر تەندروستی شای ئێران هەبوو، دەتزانی ئەو نەخۆشە، لەوێ بە شێوەیەکی ناراستەوخۆ دانی بەوەدا نابوو، بۆیەش ئێمە دەپرسین ئەگەر سەرۆك و وەزیری دەرەوەی فەرەنسا بزانن کەوا شا نەخۆشە، ئەو هەواڵە بە دەزگای هەواڵگری

خۆیان نەڵێن، یان هەواڵەکەیان لەلای خۆیانەوە پاراستووە نەوەك هەواڵەکە بگاتە زۆر گۆشەی ترەوە لەوێشەوە بڵاوبکرێتەوەو بگاتە دەزگاکانی هەواڵگری ئەمریکاو بریتانیا.

رەنگە دیستان ئەو هەواڵەی زانیبووبێت، بەڵام لەبەرئەوەی سەماحەتی ئایەتوڵا خومەینی لەلای ئەوان بووەو لە پاریس دەژیا، بۆیەش نەکراوە باس لەو مەسەلەیە بکەن. دەزگای موخابەراتی فەرەنسی کە ئەو هەواڵەی نەزانیوە زۆر توورەبووە، لە کۆتاییدا من وا دەزانم فەرەنسا لە ئاکامی مانەوەو بوونی خومەینی لە پاریس سوودی ئابووری‌و سیاسی زۆری بینیووە.

## نەخۆشی‌و، ئاوابوونی شا

لە رۆژی ١٦ی یەنایەری ساڵی ١٩٧٩دا شا بەرەو قاهیرە تارانی جێهێشتووەو دیداری ئەنوەر ئەلساداتی کردووە، لەوێشەوە بەرەو وڵاتی مەغریب رۆیشتووە. لەو سەفەرەدا تەندروستی بەرەو خراپی دەچوو، دووجار دکتۆر فلاندرینی دیبوو، ئەو قەناعەتی وابوو لە دەرەوە بتوانێت دەسەڵاتی بەسەر وڵاتدا بشکێت‌و جڵەوی حوکمی بە دەستەوە بمێنێت، بەڵام راستییەکە بە پێچەوانەی بۆچوونەکەی ئەو بوو، لەو سەردانەدا بەیەکجاری عەرشی وڵاتەکەی لە دەستداو دەستەیەك لە کۆبەندی مەلاو رووناکبیران تاجەکەیان رووخاند، وەك چۆن چەند جاری تر ئەوە بەسەر بنەماڵەکەی قاجاردا هاتبوو، دیارە ئەو سوودی لە دەرسەکانی مێژوو وەرنەگرتبوو، لە هەمووش گرنگتر

دەسەڵاتو قسەی مەلاكانی ئێرانی بە چاوێكی كەم سەیر دەكرد، وەك چۆن ئەمریكاو بریتانیاش بە هەمان چاو سەیری ئەوانیان دەكرد.

پرسیارەكەش لەو رەوشەدا ئەوەیە، ئایا نەخۆشییەكە بەراورد لەگەڵ كەسایەتیو سیاسەتەكەی چەند رۆڵی هەبوو لە رووخانی ئەو...؟ دكتۆر فلاندرین وایدەزانی كەوا باری خراپی تەندروستیو نەخۆشییەكەی ئەو، باندۆری نەبووە لە لاوازكردنی كەسایەتییەكەی بۆ بریاردان لەسەر مەسەلە هەستیارەكانی ئەو دەمانە كە لە دوا ساڵەكانی حوكمیدا رووبەرووی دەبوونەوە. نەخۆشییەكەشی هۆكار نەبوو لەسەر درەنگ هەستكردنی ئەو، بەرووداوەكان بەو شێوە دراماتیكییە؟

بەڵام گەیشتنی نەخۆشی كانسەر بە غودە لیمفاوییەكان رۆڵی هەبووە لە دەركردنی برِیارەكان، دوو مەسەلە كاریگەری لەسەر ئەو هەبوو، ماندووبوونو كانسەرەكە، هەردووكیان یەكتریان تەواو دەكرد. وەزیری دەرەوەی ئەمریكی سایروس ڤانس لە مایسی ساڵی ١٩٧٩ داوایكردبوو بە هیچ شێوەیەك لە تاراوگەكەی خۆیەوە پێشوازی لە شا نەكرێت بۆ هاتنی بۆ ئەمریكا، ئەو داوایەی لە كارتر كردبوو، هەروەها هەمان داواشی لە سەرۆك وەزیرانی ئەوكاتی بریتانیا (جیمس كالاهان) كردبوو. لە كۆتایی ساڵی (١٩٧٩) شا غودەكەی ملی ئەستوور دەبێت، بۆیەش دكتۆر فلاندرین بەرەو لای ئەو دەفرێت، داواش دەكات نەخۆشەكەی بخەنە ژێر چارەسەركردنی چرەوە، بەڵام هێشتا نەیدەویست كەس بزانێت ئەو نەخۆشەو حەزی دەكرد نەخۆشییەكەی هەر بەنهێنی بمێنێتەوە.

## دەرهێنانی زراو

شاو خێزانەکەی لە مەکسیک بوون، کە ماوەی نیشتەجێبوونیان تەواو دەبێت، مەکسیکییەکان رازی نابن ماوەی مانەوەکەی بۆ درێژ بکەنەوە، بۆیەش ئەو بەناچاری دەچێتە باهاما، لەوێ نەخۆشییەکە تەنگاوی دەکات، بۆیە دکتۆر فلاندرین لە ئۆگستی ساڵی ١٩٧٩ دەیگاتێ، لەوێ پاش پشکنینی هەستدەکات خڕۆکە سپییەکانی خوێنی کەمی کردووە، بۆیەش بەناچاری دکتۆرەکە بڕیاردەدات دەرمانە شیمیاوییەکەی کەم بکاتەوە. شا نەخۆش دەکەوێت، وادەزانن نەخۆشی مەلاریایەتی، بۆیە دکتۆری ئەمریکی بنجامین لە رۆژی (٢٩)ی سپتەمبەردا دەگاتە مەکسیک، لە پاریسەوەش دکتۆرەکەی خۆی دەگاتە سەری، بەیەکەوە چاویان لە نەخۆشەکەیان دەبێت، هەردووکیان دەبێتە مشتومڕیان لەسەر بڕیاردان لەسەر نەخۆشیو رەوشە تەندروستییەکەی، بۆیە لە رۆژی ١٨ ی ئوکتۆبەر فلاندرین دەکشێتەوە، کە وەزیری دەرەوەی ئەمریکا لە قسەی خۆی پەشیمان دەبێتەوە بۆ هاتنە ناوەوەی ئەمریکا، هانی سەرۆکی وڵاتەکەی سەرۆك کارتەر دەدات بواری شا بدات بۆچارەسەر بێتە ناو ئەمریکا، بۆیەش دکتۆرەکەی هانی دەدات بچێتە ناو ئەمریکاو ئەو دەرفەتە بقۆزێتەوە. هەتا ئەودەمانەش یەك کەس لە ئێران نەیاندەزانی شا نەخۆشی کانسەری هەیە.

شا لە رۆژی ٢٢ ی ئوکتۆبەردا دەگاتە نیویۆرك، لە سەنتەری کۆرنیلی تەندروستی قەید دەکرێت، لەوێ زراوی دەردەهێنن، ئەگەرچی دکتۆرەکان پێیان باش بوو سپڵ (فاتەرەشە)ی دەربهێنن،

بەڵام بنەماڵەکەیان ئەومیان لا خۆش نەبوو، کە پشکنینیان بۆ غودە لیمفاوییەکانی کردبوو، بۆیان دەرکەوتبوو کەوا ئەو دووچاری جۆرێکی زۆر کوشندەی کانسەربووە.

لە رۆژی چوارەمی مانگی نۆڤەمبەری ١٩٧٩ خۆپیشاندەرانی ئێرانی لە تاران هێرشیان کردبووە سەر باڵەخانەی سەفارەتی ئەمریکی، لەوێدا شێستو شەش کەسی ئەمریکاییان دەستبەسەر کردبوو، ئەو تەنگژەیە ماوەیەکی زۆری خایاند تا ئەوەی گەمارۆدانەکەو دەسبەسەراگرتنی سەفارەتەکەش (٤٤٤) رۆژی خایاند. کە مەکسیك بواری نەدا شا بچێتە ئەو وڵاتە، ئەمریکا وا بە باش دەزانێت ئەو بچێتە دوورگەی پەنەما، لەودەمانەشدا تەندروستی بەرەو خراپی دەچوو.

لە رۆژی ٢٣ ی مانگی مارسی ساڵی ١٩٨٠دا شا لە پەنەماوە دەفرێت بەرەو وڵاتی میسر، لەوێ دەستەیەك پزیشك دەبینێت لەوانە دکتۆر کین‌و دکتۆر مایکل‌و دکتۆر فلاندرین‌و دەستەیەك لە دکتۆرانی میسری، هەموولایەك بڕیار دەدەن یەکسەرو زوو سپڵەکەی دەربهێنن، بە نەشتەرگەرییەکیش پارچەو نموونەیەکیان لە جەرگی وەرگرتبوو، لەو نموونەیەوە بۆیان دەرکەوتبوو کەوا ڕەگی کانسەرەکە تەشەنەی کردووە. دکتۆر کین نەیدەویست لەدوا رۆژەکانی ژیانیداو بۆ ئەوەی تەندروستی زۆر تێکنەچێت چیتر چارەسەری شیمیاویی بۆ بکەن، بەڵام دکتۆرەکانی ترو ئەندامانی خێزانەکەی ئەومیان دەویست، بۆیەش لە رۆژی ٣١ ی مارس دکتۆر کین دەگەڕێتەوە ئەمریکاو دکتۆرە فەرەنسییەکەی دکتۆر فلاندرین لەسەر چارەسەکردنەکەی بەردەوام

دەبێت. لە رۆژی ۲۷ ی مانگی یولیۆی ساڵی ۱۹۸۰ شا لە قاهیرە دەمرێت، لەوێ بە خاك دەسپێردرێت، لە مەراسیمەکەدا سەرۆکی پێشووی ئەمریکا ریتشارد نیکسۆن و باڵوێزی ئەمریکاو فەرەنسا بەشداردەبن، لەو مەراسیمەدا بریتانیا بەرپرسێکی ئاسایی خۆی ناردبوو.

# نەخۆشی برژنێف لە قژی و بۆمبیدۆ لە میزەکەیدا زانرا

من یەکێك بووم لەوانەی بە کەسایەتی سیاسی فرانسوا میتێران سەرسام بووم، ئەگەرچی من زۆر باشیشم نەدەناسی، چونکە ئەو کەم دۆستایەتی دەکرد، لە ناوەڕاستی شێستەکاندا کە سەرۆکایەتی کۆبونەوەیەکی پەرلەمانتارە ئەوروپییەکانی ناو ڕێکخراوی چەپی ئەوروپی لە پاریس دەکرد، من بۆ یەکەمجار ئەوم دیبوو. ئەو لە کەسێکی رۆشنبیری ئاساییەوە ببووە سەرکردەیەکی باڵا، بەوەش ناسرابوو کەوا گوڵە سوورەکەی ئیشتراکی ئەوروپی نوێی بە یەخەوە بوو، من لە ساڵی ١٩٧٨ لە کۆنگرەی حیزبی کرێکاران قسەم لەگەڵدا کردبوو، کە سەرکردەی حیزبی سۆسیال- دیموکراسی بوو. کە سەرۆکی حیزبی سۆسیال- دیموکراسی بووم لە ساڵی ١٩٨٦ لە کۆشکی ئالیزێ باسمان لە هاوکاری ناوەکی ئەنگلۆ فەرەنسی کردبوو. جارێکی تر لە سەرەتای سپتەمبەری ساڵی ١٩٩٢ چاوم پێکەوتبوو کە ببوومە ڕاوێژکاری یەکێتی ئەوروپی لە یۆگۆسلافیای پێشوو، هەروەها چەند جاری تریش دیمانەمان بووە.

## لە لووتکەی دەسەڵاتدا

لە یەکەم هەڵبژاردنەکانی سەرۆکایەتی فەرەنسی لە ٢٦ ی ئەپریلی ساڵی ١٩٨١ میتێران کاندیدی سۆسیالیستەکان پلەی دووەمی لە بەرامبەر سەرۆك ڤالیری جیسکار دیستان بەدەست هێنابوو، کە پێش ئەو سەرۆك بوو، کە تێدا زووتر لەسەر جاك شیراكو کاندیدی شیوعییەکان جۆرج ماشیە سەرکەوتبوو، کە ڕێژەی ٢٠٪ یان هێنابوو، ئەو جارە تەنها ١٥،٥٪ دەنگیان هێنابوو، کە میتێران زۆرتر لە ٢٥٪ دەنگی هاوردبوو. لە خولێکی تری هەڵبژاردندا میتێران تەنها ڕووبەڕووی سەرۆك دیستان دەبێتەوە، کە لەو دەمانە فشاری سیاسی زۆری لەسەر بوو لە ئاکامی بەرزبوونەوەی نرخی پترۆڵ ، پاش ئەوەی جاری یەکەم لە ساڵی ١٩٧٩ ئەو تەنگژەیە ڕوودەدات، هەروەها کە یەکێتی سۆڤیەت مووشەکە ناوەکییەکانی جۆری ئەس ئەس ٢٠ لە ئەورووپای خۆرهەلات تاقی دەکاتەوە، ئەو لە فشارو پەرچدانەوەکە دوودڵ دەبێت، ئەوەش باندۆری لەسەر کەسایەتی ئەو دەبێت، یان لەبەرئەوەی پارچە ئەڵماسێکی بە دیاری لە ئیمپراتۆری ئەفریقیای ناوەڕاست بۆکاسا وەرگرتبوو. میتێران لە خولی دووەمدا بە ڕێژەی ٥٢٪ کۆی دەنگەکانی بەدەستهێنابوو، بەوەش لە ٢١ ی مایۆی پۆستی سەرۆکایەتی وەردەگرێت، ئەوەش نیشانەیەك بوو کەوا لە ڕووی سیاسییەوە میتێران دەستی دەڕۆیشت، لەو ڕۆژانەش وەك کەسێکی قۆزو تەندروست و سەلامەت دەردەکەوت، میتێران یەکسەر فەرمان دەدات پەرلەمان هەڵوەشێنێتەوە، لە هەڵبژاردنەکەشدا لە ئەنجومەنی یاسادانانی فەرەنسی زۆرینەی ڕەهای دەنگەکان بەدەست دەهێنێت، کە حیزبی ئیشتراکی تێدا ڕێژەی ٣٨٪ دەنگەکانی وەرگرتبوو.

## لە نهێنییەکانی دەوڵەت

لەکاتی هەڵمەتی هەڵبژاردنەکاندا تەندروستی میتێران پەردەیەکی توندی بۆ شاردنەوەی رەوشی سەلامەتی لەسەربوو، ئەو پەیمانی دابوو ئەگەر لە هەڵبژاردنەکە دەربچێت هەر شەش مانگ جارێك و بەردەوام لێدوانێکی رەسمی رادەگەیەنێت و هاووڵاتیان لە سەلامەتی خۆی دڵنیا دەکاتەوە، کە میتێران و هاووڵاتیان زانیبوویان سەرۆك جۆرج بومبیدۆ نەخۆش بوو، هەر بەو نەخۆشییە کە کانسەری خوێن بوو مرد، تووشی شۆك ببوون. هاووڵاتیانی فەرەنسی ئەومیان نەدەزانی کەوا سەرۆك بۆمبیدۆیش نەخۆشە. کە ڤالیری جیسکاریش لە ساڵی ١٩٧٤ خۆی کاندید کردبوو وەعدی بە فەرەنسییەکان دابوو، بەردەوام لێدوانی روونیان لەسەر تەندروستی خۆی پێشکەش بکات، کە ئەو سەلامەتەو دەتوانێت کارەکانی راپەڕێنێت، بەڵام کە لە هەڵبژاردنەکە دەردەچێت ئەو بەڵێنە جێبەجێ ناکات، بۆئەو سەرپێچییەش هیچ بیانوویێك پێشکەش ناکات. لە ساڵی ١٩٨١ یەکەم بڵاوکراوە لە لایەن دکتۆر گلۆد گویل کە دکتۆری تایبەتی سەرۆك میتێران و خێزانەکەی بوو پێشکەش دەکرێت. لە ساڵی ١٩٦٩ وە، وا دەزانرا کەوا سەرۆك تەندروستی زۆر باشەو چاپوکانە کارەکانی بەڕێوە دەبات. پاش شەش مانگ لە ناکاو و پاش گەڕانەوەی لە سەفەری کۆنگرەی لووتکەیی کانکۆن لە مەکسیك لە کۆتایی مانگی ئۆکتۆبەردا هەستکرا کەوا سەرۆك میتێران ژانەپشت و باسکەکانی هەیە، کە هەستیش کرا دەشەلێت هەست بە مەترسی کرا، کە دکتۆر گوێل پشکنینی پێویستی بۆ دەکات، دەردەکەوێت میتێران پرۆستاتێکی

قەبەو رەقی هەیە.

(گویل) دکتۆرە تایبەتییەکەی سەرۆك میتێران، لە رۆژی ۷ ی نۆڤمبەردا بە ئوتومبێلێکی کۆن و بە بێ پاسەوانی پۆلیسەکانی کۆشکی ئالیزێ دەیباتە نەخۆشخانەی (ڤال دوگراس)ی سەربازی، بە ناوێکی خواستراوی (ئەلبیر بلوت) چەندین پشکنینی وردی ئێسك بۆ نەخۆشییەکی ترسناکی بۆ دەکەن. لە ئێوارەی رۆژی ١٦ی نۆڤمبەری ساڵی ١٩٨١ دکتۆر گویل نوزداری ناودارو پسپۆڕ لەو نەخۆشیانەو لەگەڵ (ئودولف ستیگ) پرۆفیسۆر لە نەخۆشییەکانی غودەی لیمفاوی دەچێتە کۆشکی ئالیزێ. لەوێ ستیگ بە گویل دەڵێت ئەو برینانەی لە ئێسکی میتێراندا دیارن کە لە تیشکەکانی پێشوودا بۆی وەرگیراوە دەردەکەوێ، جۆرێکە لە گەشەبوونێکی لاوەکی لە کانسەری پرۆستات. لەوێ بە سەرۆك میتێران دەڵێن ئەو کانسەرەکەی لە قۆناخێکی گەشەداردایە لە غودەی پرۆستاتدا، رێژەی ناومندیش بۆ ژیانی ئەو نەخۆشانە سێ ساڵە، بەڵام ئەگەری جۆرێك لە رێزپەڕیش هەیەو رەوشی ئەویش دڵخۆشکەر نییە.

## دکتۆرێکی ئاشکرابێژ

بەپێی قسەکەی گویل، ستیگ راشکاوانە بۆچوونەکەی خۆی راگەیاندبوو. پێشتریش و لە رۆژی ١٣ی نۆڤەمبەردا گویل بە سەرۆک میتێرانی وتبوو، کەوا ئەنجامی پشکنینەکان باش نین، بەڵام بە روونی وشەی کانسەری پێ نەوتبوو، ئەگەرچی فۆناغەکەی زۆریش پەرەی سەندبوو، بەڵام ستیگ بە بێ دوودڵی قسەکانی خۆی کردبوو، بە سەرۆکی وتبوو:

پۆستەکەی من وایە ناگرێ راستییەکەت لێ بشارمەوە، تۆ کانسەری پرۆستاتت هەیە، ئەوەش رەگەکەی گەیشتووتە ناو ناخی ئێسکەکانت.

کە میتێران ئەو قسەیە دەبیستێت، بە دەنگێکی لاواز و نەرم دەبێژێت:

کەواتە من کۆتاییم هاتووە.

بەڵام دکتۆر ستێگ وەڵامی دەداتەوە و دەڵێت:

وا مەڵێ، ئێمە ناڵێین مەسەلەکە تەواو و تۆش کۆتاییت هاتووە، لەگەڵ دکتۆر گویل، هەموو شتە پێویستەکان دەکەین. بەڵام سەرۆك میتێران قسەکەی دەبڕێت و دەڵێت:

لە هەڵخەڵەتاندنم وازبێنە... من تەواو بووم.

بەڵام ستێگ، وەڵامی دەداتەوە و دەڵێت:

لە راستیدا رەوشەکە ترسناکە، بەڵام دەست دەکەین بە چارەسەرکردنت، بۆیەش دەبێ تۆ لەسەر ئەو چارەسەرکردنە رەزامەندیت هەبێت، هەموو هەنگاوەکان رەزامەندی تۆی دەوێت،

ئەگەر ئەوەش نەکرێت...

لێرەدا سەرۆک قسەکانی ئەو دەبڕێتو دەڵێت:

ئەگەر من رازی نەبم، قسەکەی تۆ وایە من تەواو بووم، تۆ هیچ رێگای ترت بۆ نەهێشتمەوە.

لێرەوە ستێگ، لەگەڵ ئەو زۆر راشکاوانە قسەی کردبوو، بۆیە وەڵامەکەی بەو شێوەیە بوو:

کە کانسەری پرۆستاتەکەت بەو شێوە ناسروشتییە گەشەدەکات، شێوازەکان بە شێوەیەکی خراپ بەڕێوە دەچێت. ئەگەر نەکرا بڕینەکە بکوژین، ئەوە پرۆسەکە چەند مانگێك دەخایەنێت.

## دارودەستەکەی ئەوە بە درۆ دەخەنەوە

گەورە یاریدەرەکانی سەرۆك میتێران (بیار بیریگوفو) لەودەمانەدا وتبووی، ئەو قسانەی کراون کەوا سەرۆك دووچاری نەخۆشییەکی ترسناك هاتووە راست نییە، دکتۆر هەموو ئەنجامی پشکنینەکانی بەو راگەیاندووە. ئەو قسەو هەواڵانەش پاش ئەوە راپۆرتێکی چوار لاپەڕەیی لەسەر سەردانی سەرۆك میتێران بۆ نەخۆشخانە لە هەفتەی رابردوو لەگەڵ چەندین وێنەیەوە لە گۆڤاری باری مانتش بلاوکرایەوە.

# پەیامەکە

لەو دەمانەدا سەرۆك میتێران رووبەڕووی تەنگژەیەکی سیاسی دەبێتەوە، نەك تەنها لە رووی دەستنیشانکردنی نەخۆشییەکەی و بەس، ئەومیان دەتوانی خۆی بڕیاری لەسەر بدات و چارەسەری بکات، بەڵام کێشەکە لەوەدابوو کەوا ئەو زووتر بەڵێنی دابوو، کەوا راشکاوانە بەیانێك دەربکات و باس لە تووشبوونی خۆی بە نەخۆشی کانسەر بکات، ئاماژە بە قۆناغەکانی چارەسەرکردنی خۆی بدات، کە لە نەخۆشخانەکان بۆی دەکرێت. ئەو پەیامە بۆ ئەو بەس بوو، پێویستیشی نەدەکرد باس لە ناوی نەخۆشییەکە و تووشبوونی بە کانسەریش بکات، کە چۆن گەیشتوونەتە ئێسکەکانی، ئەوەش ببێتە پەیامێکی روون کەوا ئەو لە کارنامەو رۆژانەی خۆی چالاکانە کاردەکات بەردەوام بێت، ئەوەش رێگا لەو وتارانەش دەگرێت کەوا ئەو دەبێ دەست لەکار بکێشێتەوە. لەو رەوشەدا زۆربەی زۆری دەنگدەرە فەرەنسییەکان ئامادەییان هەبوو، چاوەڕوان بکەن، بوار بە سەرۆك بدەن بەردەوام بێت و چاودێری رەوشەکە بکەن، ئەو مەسەلەیەش حیزبەکەی نیگەران کردبوو، بەڵام هەموو سەرۆکە فەرەنسییەکان کە دەنگیان هێناوەو بوونەتە سەرۆك بێ پشتیوانی حیزبەکەیان و هاوڕێیەکانی توانیویانە سیاسییانە کارەکانیان راپەڕێنن.

# هەڵخەڵەتاندن لەجیاتی راشکاویی

لەجیاتی ئەوەی سەرۆك میتێران راستی رەوشی تەندروستی خۆی بە هاووڵاتیان رابگەیێنێت، مەسەلەکەی بەنهێنی هێشتۆتەوە. بە قسەی دکتۆر گوبلر، سەرۆك یەکسەر مەسەلەی نەخۆشییەکەی خۆی وەك نهێنییەکی دەوڵەت ناساندبوو، حەزی نەدەکرد ئەوەیان ئاشکرا بکات. بە دکتۆر گوبلری وتبوو، ئەو نهێنییە لەلای خۆت بپارێزە. هەمووڵایەك دەیانوت، ئەگەر دکتۆرەکە نهێنییەکەی ئاشکرا کردبوایە باجەکەی بە گرانییەوە دەدا، کە دە ساڵیش دکتۆری ئەو بووە، مانای ئەوە بووە ئەو نەیویستووە دەست لە کار بکێشێتەوەو دەسبەرداری ژانی نەخۆشییەکەی نەبووەو لەکاتی تەنگانەدا لەو دوور نەکەوتووەتەوە، هەردوو دکتۆرەکە گوبلرو ستێگ بە یەکەوە هەموو داواکانی نەخۆشەکەیان قبووڵ بووەو مەسەلەکەشیان بە نهێنی هێشتۆتەوە، بەوەش خزمەتێکی مەزنیان بەو گەیاندووە. میتێران دکتۆرەکانی خۆشی ئاگادار کردەوە کەوا نابی نهێنی نەخۆشییەکەی بە ژنەکەشی بڵێن، خۆشی بە هاوسەرو منداڵەکانیشی نەوتبوو، ئەو مەسەلەیە بە شاراوەیی تا ساڵی ١٩٩١ بۆ دانیال میتێران ماوەتەوە، ژنەکەی وتبووی ئەو بە سادەییەوە هێمنی رۆحی ئێمەی دەپاراست.

# دكتۆرە دەبەنگەكان

هەنـدێ نـەخۆش هەیـە داوا لـە دكتۆرەكـانی دەكـات، رەوشـی تەندروسـتییان لـە ماڵـەوەیان بشارنەوە، راسـتی نەخۆشـییەكانیان بـە كەسـوكاریان نـەڵێن، بـەڵام سـەرۆك كۆمارێـك كـە بـە شـێوازێك و لـە پرۆسـەیەكی هەڵبـژاردنی دیموكراسـیانەدا هەڵبـژێردرابێت، نـاكرێ نەخۆشـییەكەی لـە هاووڵاتیـانی خـۆی بشـارێتەوە، چـونكە ئـەو نەخۆشـێكی ئاسـایی نییـە، ئـەو ئیلتیزامـی راسـتبێژی داوەو سـەرۆك میتێرانیش ئەو راستییەی باش زانیوە، بەڵام سەرپێچی كردووەو خۆی لـەوەیان دوور راگرتـووە. سـەرەتا میتێـرانیش دوودڵ بـووە لـەوەی هەواڵی نەخۆشییەكەی بە شاراوەیی بمێنێتـەوە، دكتـۆر گـوبلر دڵنیایـە كەوا سەرۆك میتێران لەگەڵ یەكێك لـە یاریـدەرە نزیكـەكانی ئـەویش جاك ئاتاڵی بوو باسی مەسەلەكەی كردووە. كە ئاتـاڵی بیرەوەرییـەكانی لە دیسمبەری ساڵی ١٩٨١ چاپكردووە لەوێ وتوویەتی:

سـەرۆك میتێـران بـەمنی وتبـوو مـن نـەخۆشـی كانسـەرم هەیـەو چارەسەریشی نییە.

پاش چەند رۆژێك ئەو وتبووی:

سەرۆك بە منی وتبوو، دكتۆرەكان دەبـەنگن نـازانن، دەڵێن گوایـە من كانسەرم هەیە.! ئەوەش دیارە كـەوا سـەرۆك میتێـران دوودڵ بـووە لـــەوەی نەخۆشـــییەكەی رابگەیـــەنێت، بڕیاریشـــی داوە هـــەواڵی نەخۆشییەكەی زۆر نهێنی بێت، بەڵام ئاتاڵی لە كتێبەكەیدا باسی ئـەو دوودڵییەی نەكردووە.

## گرفتێکی ئەخلاقی

ئەو تەنگژە ئەخلاقیو مەعنەوییەی سەرۆك میتێران بۆ دکتۆر گوبلر زۆر قووڵ بوو، چونکە ناوەکەی ئەو پاش شەش مانگ لە بەیانە رەسمییەکەی سەبارەت بە تەندروستی سەرۆك دەهات. بە قسەکانی دکتۆر گوبلر کە وتبووی:

مـــن دووچـــاری درۆیـــەکی گـــەورە هـــاتبووم ســـەبارەت بـــە نەخۆشییەکەی سەرۆك میتێران، ئەو درۆیەم پازدە ساڵ هەڵگرتبوو، تا توانیم رزگارم بێت، درۆیەکەی ئێمە هەموو شتەکانی شاردەوە.

دکتۆرەکانیش پاش ئێمە درۆیەکەیان درێژە پێ دەداو رایانگەیاند کـــەوا نەخۆشـــەکەمان مـــاوەی پێـــنج ســـاڵ دەژیـــت، ئەگەرچـــی دەستنیشـانکردنەکە لـەنێوان سـێ سـاڵ تـا سـێ مـانگ دەبـوو، ئەگـەر جەستەی نەخۆشەکەمان بەرگەی ئەو چارەسەرییە بگرێت.

گوبلر نووسیبوی:

نەخۆشەکەمان سەرەتا درۆی لەگەڵ خودی خۆی دەکـرد، ئـەوەش هەڵسوکەوتێکی ئاسـاییە کـە خـەڵك دەیکـات، بـەڵام پاشـان ئـەو درۆی لەگـەڵ خەڵکەکـەش کـرد، کـە مـن لـە مـانگی دیسـمبەردا سـەرقاڵی سازکردنی دارشتنی بـەیانێك بـووم سـەبارەت بـە تەندروسـتی سـەرۆك، ئەو بە منی وت، هەرچی بێت نابێ راستی رەوشی تەندروستیم ئاشـکرا بکرێت.

لــە کــاتی ســازکردنی دووەم پــەیامی میتێــران، دکتــۆر گــوبلر هــەنگاوێکی گرنگــی هاویشــتبوو، ئــەو بەراســتی بەشــداربوو لــە ئامـادەکردنی بەیانەکـەو نەخۆشـەکەش رازی نییـە راسـتییەکە ئاشـکرا

بكرێت، دكتۆرەكەش كۆشش دەكات میتێران رازی بێت راستییەكە لە بەیانەكە بگوترێت- یان چیتر بەیانی نوێ دەرنەچێت، وەك چۆن زووتر جیسكار دیستانیش ئەوەی كردبوو. دكتۆرەكە سووربوو لەسەرئەوەی لە بەیانەكەدا ناوی ئەو نەهێنرێت و تەنها پەیڤداری كۆشكی ئالیزێ بێت، پێویست ناكات ناوی دكتۆرەكەش لە بەیانی دووەم هەبێت، دیارە ئەوەش ئاسان نەبوو، چونكە زووتر لە بەیانەكەدا ناوی هاتبوو، وەك چۆن دكتۆرەكانی سەرۆكەكانی تری كۆمار كردوویانەو ناویان هاتووەو لە هەموو بەیانەكانی تەندروستی سەرۆكەكان ناوی دكتۆرەكانی پێوە بووە.

## رەوشێكی نائاسایی

هەر شەش مانگ جارێك راپۆرتی تەندروستی سەرۆكەكان بە ناوی دكتۆرەكانەوە دەردەچێت. بۆیەش كاتی ئەوە هاتبوو دكتۆر گوبلر بكەوێتە رەوشێكی نائاسایی، ئەو حەزی دەكرد لەو رەوشەدا هیچ لێدوانیش دەرنەچێت، بەلام سەرۆكە نەخۆشەكەی دەرچوونی ئەو بەیانەی دەویست. لە كۆتایی شێوەی دارشتنی بەیانەكە هەردوولا گەیشتنە رێكەوتنێك كەوا بەیانەكە ناتەواو بێت، مەبەستیش لەو بەیانەش دڵنیاكردنی هاولاتیانی فەرەنسی بوو كەوا سەرۆكەكەیان سەلامەتەو نەخۆشی كوشندەی نییەو ئەوان وەك سەرۆكی پێشوو جۆرج بومبیدۆ ناكەن كە راستی نەخۆشییەكەی لە میللەت دەشاردەوە، گوبلر ئەو رۆژە ناخۆشەی لەبیرمابوو كە دووچاری ببوو. رۆژێكیان

دکتۆرێکی هاوڕێی خۆی لێی دەپرسێت ئەگەر ڕۆژێکیان سەرۆك میتێران زانی نەخۆشەو نەخۆشییەکەی کوشندەیە، ئەو ڕازی دەبێت ئەوە بە بەیانێك ڕابگەیەنن، گوبلر وەڵامی بە بەڵێ داوەتەوە، بەڵام باشیشی دەزانی کەوا سەرۆك بە پێچەوانە دەجوڵێتەوە.

لە نۆڤمبەری ساڵی ۱۹۸۱ەوە میتێران بۆ چارەسەرکردنەکەی هۆرمۆنی ئەستروجینی وەرگرتووە، ئەوەش ماددەیەکی دژە پەیتبوونی خوێنی تێدایە، ئەو دەرمانەش کاردانەوەی لاوەکیشی هەیە، ڕێژەی ۳۰٪ نەخۆشەکان لە دوو ساڵی یەکەمی تووشبونیان بەو نەخۆشییە دەمردن. ئەو ڕۆژانەو بۆ ماوەی دوو هەفتە دەرزییەکی بەهێزی ئەستروجینی وەردەگرت. پاشان تا کۆتایی مانگی فبرایری ساڵی ۱۹۸۲ دوو ڕۆژ جارێك ئەو چارەسەرییەی وەرگرتووە، پشکنینەکانیش لە تاقیگەی ڤال دوگراسەوە دەکراو لە تاقیگەیەکی تریش دڵنیابوونی بۆ دەکرا، لەبەرئەوەی هۆرمۆنەکە زۆر بەهێزبوو بۆیە دەدەکرا ئەومیان بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ وەرگرێت، ماوەکە بگاتە سێ تا چوار مانگ.

دکتۆر گوبلر بەردەوام لەگەڵ سەرۆك میتێران سەفەری کردووە، ئەو خۆی سەرپەرشتی چارەسەری و دەرمانەکانی ئەوی کردووە، کە دەگەڕایەوە پاریس زوو کەلوپەلەکانی فڕێدەدا، سەرۆك لەوە دەترسا بەو کەرەستانە جاسووسی لەسەر ئەوو دکتۆرەکەی بکەن. فەرەنسییەکان وا دەزانن کەوا سەرۆکی یەکێتی سۆڤیەت لیونید برژنیف بە هۆی تاڵە مووەکانی سەریانەوە کە لە شانەکەی وەریانگرتبوو، تێگەیشتبوون کەوا برژنێف نەخۆشەو چ دەرمانێك بەکاردەهێنێت، بۆیەش ئەو سەرکردانەش زۆرجار فێڵیان کردووەو

جاسووسەکانیان چەواشە کردووە، ئەو مەسەلانە زۆربوو، ترسەکان زۆربوون، وایاندەزانی پاشماوەو کەڤ سابوونی ناو بانیۆکانیان بۆ پشکنین هەڵدەگرنەوەو حکومەتەکان بەو جۆرە سۆراغی تەندروستی سەرۆکەکانی ولاتانیان کردووە، ئەوان وا دەزانن کەوا میزی سەرۆك بۆمبیدۆیان بۆ پشکنین وەرگرتووەو بەوەش زانیوویانە ئەو چ جۆرە نەخۆشییەکی هەیە، بۆیەش گوبلر زۆر بە وردی چاودێری گەرماوو ئاوی سیفۆنی توالیتەکەی میتێرانی پاش بەکارهێنانی کردووە. گوبلر بەو شێوەیە باس لەسەردەمی ئەو یازدە ساڵەی تەمەنی میتێران دەکات، کە نووسیویەتی:

لەو ساڵانەدا ئەو گەمەی خۆدزینەوەی لەگەڵ مردن کردووە. دانانی پەردەی نهێنی لەسەر نەخۆشییەکانیش بێگومان مەترسی لەسەر نەخۆشەکەش زۆرتر دەکات، بەلام کەسە نەخۆشەکە ئامادەبووە ئەو قوربانییەش بدات، تەنها لە پێناوی ئەوەی کەس باری تەندروستی ئەو نەزانن، ئەو لە ئەنجامی ئەو دەرمانەی بۆ کەمکردنەوەی پەیتبوونی خوێنەکەی بەکاریهێناوە، لە ساڵی ١٩٨٢ دووچاری نەخۆشی گیرانی سییەکان بووە.

## بە فیلّەکانی خۆی میتیّران نەخۆشییەکانی شاردۆتەوە

یەکێك لەو هۆکارانەی کە بە هۆیەوە پەردە لە سەر نەخۆشییەکەی میتێران لانەدەدرا، ئەوەبوو کەوا میتێران شارەزایی لەو دەرمانانە نەبوو کە بەکاریهێناون، ئەو وایزانیبوو ئەو دەرمانەی دکتۆر گوبلر بۆی دانابوو بۆ چارەسەری رۆماتیزمە، دیارە ئەو فێلّەش یەکێك بووە لە شێوەکانی هەلّخەلّەتاندن سەبارەت بە رەوشی سەرۆك میتێران. کەسایەتی ئەو مەرجێکی سەرەکی بووە بۆ تێگەیشتنی بڕیارەکە بە شێوازە نهێنییەکە، چونکە ئەو کەسێك بوو نهێنی پارێزی بەشێکی سروشتی بووە لە ژیانی سیاسیدا، بۆیەش ئاساییەو سەرسامی ناوێت کە هەندێ جار ناوی ئەویان بە (ئەبو هۆل) ناوبردووە.

## خەلاتێکی نازییانە

که تۆماری چالاکییەکانی ئەویان لەسەروبەندی شەڕی دووەمی جیهانی کردووە، ئەو خەوشەیان لەو دۆزیوەتەوە، ئەو لە ڕۆژانی کۆتایی شەڕەکەدا لە ڕێزەکانی بەرگری میللی فەرەنسیدا بووە، لەوێ بەلگەو بەرنامەی پرۆسەکانی هەلاتنی دیلەکانیان سازکردووە. لە ساڵی ١٩٤٣و لە ژێر ناوێکی خوازراودا (کاپتن مورلان) لەگەڵ (موریس بینو)ی سەرۆکی قومیسارییەکان، هاوکاربووە لە دانانو گەشەپێدانی تۆڕیکی بەرگری بە ناوی (بزاڤی نیشتیمانی بۆ دیلو کۆچبەرەکانی شەڕەکە)، بەلام میتێران لە ساڵی ١٩٤٣دا لە مارشال (فیلیپ بیتان) ی سەرۆکی حکومەتی فیشی کە هاوکاری داگیرکەرە ئەلمانیەکان بوو لە فەرەنسا خەلاتکراوە، دیارە ئەو خەلاتەش دەدرایە ئەو کەسانەی جێگای بڕوا بوون، ئەو خەلاتەش کە میتێران وەریگرتووە لە ژیانی سیاسیدا بەردەوام جێگای گومانو پرسیاری ترسناك بووە، چونکە بەومیانەوە دیارە کەوا ئەو هاوکاری داگیرکەرە نازییەکانی کردووە، بەردەوام بەوە تاوانبارکراوەو هەڕەشەی لێکراوە، ئەو هەر بەوەندە وەلامی داوەتەوە، کەوا ئەو شانازی بە کەرامەتی خۆیەوە دەکات.

## چەپکە گوڵێك لەسەر گۆڕی بیتان

ئەو کە لە ساڵی ١٩٩٢ دا پۆستی سەرۆکایەتی وڵاتی وەرگرتووە گوێی نەداوەتە ئەو کەسانەی رەخنەیان گرتووە، بەڵکو راستی هاوکاریی داگیرکەرانی دووپات کردۆتەوە، ئەویش بە دانانی چەپکە گوڵێك بووە لەسەر گۆڕی بیتان، ئەو هەنگاوەش نوێ و کەسنەکردە نەبوو، زووتر سەرۆك دیگۆل و سەرۆك جیسکاریش لە یادی پەنجا ساڵە و شێست ساڵەی کۆتایی شەڕی دووەمی جیهان فەرمانیان داوە گوڵ لەسەر ئەو مەزارە دابنێن. بیتان سەرۆکی هێزەکانی فەرەنسی بووە لە شەڕی فیردون، بەڵام گوڵدانانەکەی میتێران جێگەی وروژاندنێکی گەورەبوو.

دیارە کەوا میتێران راستییەکی شاراوە لەسەر فەرەنسا دەزانێت، نایەوێ ئەو کیشەیەی لەسەردەمی ساڵانی حوکمی (فیشی) بە بنبڕی کۆتا بێنێت، ئەو هەستەش لەناو نەوەکانی سەردەمی گەنجی ئەو رۆژانە رەنگی داوەتەوە، کە حکومەتی فیشی دەستی لەگەڵ داگیرکەران هەبوو، تا ئێستاش لایەنی شاراوەیی تێدایە.

لە کاتی حکومەتە کاتییەکە کە لە مانگی ئۆگۆستدا چاوەڕوانی گەڕانەوەی دیگۆلیان دەکرد، ئەودەمانە میتێران تەمەنی ٢٧ ساڵ بوو، دوو هەفتە بوو دەستنیشانکرابوو بۆ ئەوەی ببێتە سکرتێری گشتی لیژنەی دیلەکانی شەڕەکە، لە کاتی شەڕەکەدا لەگەڵ دیگۆل لە جەزائیر بەشداری کۆبوونەوەیەکی شپرزە دەبێت، کە داواکار دەبن سێ رێکخراوی تایبەت بە کاروباری دیلەکان یەکبگرنەوە، لەوێش داوای لێنەکراوە لە سەردەمی دیگۆل بەشداری حکومەت بکات، بەڵام لە

حکومەتەکەی (بۆل رامادییر) لە ساڵی ١٩٤٧ وەك وەزیری سەربازە دێرینەکان بەشداربووە. لە نێوان ساڵانی ١٩٤٧ تا ١٩٥٨ لە ماوەی کۆماری سێیەمدا میتێران یازدە جار بەشداری حکومەتی کردووەو بە چاوی کەسێکی نائیشتراکیش سەیری کراوە، ئەو وەك نوێنەرێکی سەربەخۆ بەشداربووە.

## چیرۆکێکی شاراوە

میتێران لە رێگای چیرۆکی شاراوە، کە گوایە هەندێکیان هەڵبەستراون‌و وەك پڕوپاگەندە بەکارهاتوون، ناوی بە کەسێکی فێلباز دەرکردبوو. لە رۆژی ١٦ ی ئوکتۆبەری ساڵی ١٩٥٩ لە رۆژنامەکان هەواڵی ئەوە بڵاوکرایەوە کەوا میتێران لە هەوڵێکی کوشتندا دەربازی بووە، پەرلەمانتاری راستڕەو (رۆبیر بیسکیە) میتێرانی بەوە تاوانبارکردبوو، کەوا ئەو جۆرە هەواڵانە بۆ ئەوە هەڵدەبەستێت تا سۆزی جەماوەری میللی بۆ خۆی راکێشێت. لە ئەنجامدا حەسانەی پەرلەمانی لەسەر لادەچێت تا رەوانەی دادگای بکەن، بەڵام پاشان سەیری کێشەکە نەکرا، چونکە پەرلەمانتار بیسکیە لە وڵات رایکرد، ئەو کێشەیەش زیانێکی گەورەی بە میتێران گەیاندبوو، ئەو دووبارە گەڕاوەتەوە سەر کارە نهێنییەکانی خۆی، بەئاشکرا بەرگری لە خۆی نەکردووە.

## دەربازبوونێکی شاراوە

یەکێك لە کارە شاراوەکانی میتێران ئەوەبوو کەوا لە مەیدانی سیاسیی فەرەنسییەوەو لە ریزی راستڕەوەکانەوە هاتۆتە ناو چەپەکان، ئەو لەو ماوەیەدا لە کەشێکی تەماویی شاراوە خۆی شاردۆتەوە کە خۆی بۆ خۆی دەیخولقاند. لە ساڵی ١٩٦٥ بەشداری هەڵبژاردنی سەرۆکایەتی بە رووی ژەنراڵ دیگۆل دەکات، لەوێوە بەوە دەردەکەوێت کەوا دەتوانێت بەرەیەك بۆ چەپەکان دامەزرێنێت، لەو هەڵبژاردنەداو لە خولی دووەمیدا ئەو دەتوانێت ٤٥٪ کۆی دەنگەکان بەدەست بهێنێت. لەو رۆژەوە میتێران دوا رۆژێکی پرشنگداری لە سیاسەت لەپێشدا دەگرێتەوە، ئەو وەك کەسێکی رۆشنبیرو خاوەن خولیای خوێندنەوەو کتێبیش دەناسرێت، بەوەش پێناسە کرابوو، کەوا ئەو کەسایەتییەکە لە دەرەوەی رۆمانەکە.

## بنەماڵەیەکی هاوسەنگ

یەکێك لە نهێنییەکانی ئەو لەوە دەرکەوتووە کە نەخۆش کەوتووە، سەرکەوتنی نهێنییەکانی ئەو لەوە سەرچاوەی گرتووە کەوا ئەو ژیانێکی هاوسەری هاوسەنگی هەبووە، کە ماوەیەکی زۆریش بە نهێنی لەگەڵ ژنە دۆستەکەی (نان بینگۆ) ژیاوە، کە لەو ژنە کیژێکی بەناوی (مازارین) هەیە. راستی کیژەکەی لە هاوڵاتیانی فەرەنسی شاراوەتەوەو بە نهێنی ماوەتەوە تا ئەوەی لە رۆژی ١٠ی نۆڤەمبەری

سـالّی ١٩٩٤ مەسـەلەکە لەسـەر لاپـەڕەکانی گۆڤـاری بـاری مـاتش ئاشکرابووە، بەڵام ئەودەمانـە تەمـەنی کیژەکـەی میتێـران گەیشتبووە بیسـت سـالّ، واتـە ئـەو نهێنیـە ماوەیـەکی زۆر شـاراوە بـووە، کـە مەسەلەکەش ئاشکرا دەبێت میتێران تەنها شەش مانگ مـاوەی پۆسـتی سەرۆکایەتییەکەی مابوو.

کە لە سالّی ١٩٨١ دەزانرێت میتێران دووچاری نەخۆشـی کانسـەری پرۆستات بووە، ئەو لە شاردنەوەی نهێنییـەکان پسپۆڕبووە. هـەبوونی نهێنییەکان لە ژیانی میتێران زیانی زۆری بە ژیـانی سیاسـی ئـەو داوە، لـــە هەمووشـــیان کوشـــندەتر ئـــەوەبوو کـــە کەســـێکی سیاســـی دیموکراسیخوازی لایـەنگیری حیزبـی ئیشـتراکیو زۆرینـەی هاولاّتیـان بـووە، داواکـاری بـەردەوام بـۆ مافـەکانی تاکـە کـەس بـووە، تـا دەبێتـە سیاسییەکی بـەزەبرو نقومبـوو لـە دەسـەلاّتی دەوڵەتـدا. ئـەو بـە هـۆی دروشمـە سیاسـییە دیموکراسـییەکانی گەیشـتبووە لووتکـەی دەسـەلاّت، بـەڵام لـەناکاو ئـەو بەرنامەیـەی تـەنها وەك بـزارێك دەمینێتـەوەو حیزبەکـەو دەنگـدەرەکانو مـافی رەوای فەرەنسـییەکان، بـە ژنو بـە پیاوەوە دەکرێتە کەسێك لـە پلەیـەکی لاوەکی سادە، تـەنها بـۆ ئـەوەی ئارەزووی بووە نەخۆشییەکەی بەنهێنی بمێنێتەوە.

## گوێگرتن بۆ بەرژەوەندی سەرۆك

میتێـران گروپێکـی بـە نـاوی (گروپـی قەلاچـۆکردنی تـیرۆر) دادەمەزرێنێت، ئەو گروپە راستەوخۆ لە ژێر چاودێری خۆی دەبێت، کە دوورە لـە شـێوە پۆلیسـی نیشـتیمانیو ژەندرمییەکـەی جـاران و بـە سەرپەرشتی سـەرۆك وەزیـران ئەنجومـەنی وەزیـران مامەڵـەیان لەگـەڵ کێسی تیرۆر دەکرد، بەڵام لەبەر رۆشنایی رێنماییـەکانی میتێـران شانەکە ئەو ئەرکەی دەکەوێتـە سەرشان، کـە هـیچ بنەمایـەکی یاسایی گونجاویـان نـەبوو. رۆژنامـەی لیبراسـۆن پـەردەی لەسـەر ئـەوە هـەڵماڵیبوو کـەوا سەرۆکایەتی گوێی لە تەلەفۆنەکان رادەگرێتو سەرۆك میتێرانیش سوور بووە لەسەر ئەوەی ئەو شتە بەنهێنی بمینێتەوە، بە بیانووی بەرژەوەندی دەوڵـەت، ئـەوەش پێشـەنگی هەڵمـەتێکی بـەرفراوانی نایاسـایی دژ بـە تایبەتمەندی تاکە کەس بووە لە مێژووی کۆماری فەرەنسیدا. گوێگرتن لە تەلەفۆنـــەکانی ژمارەیـــەك لـــە سیاســـەتمەداران و رۆژنامەنووســـان و بەخشکەران و کەسایەتییەکانی دیـاری نـاو پـاریس، لەلایـەن تیمێکـەوە بـە فـەرمانی راسـتەوخۆی سـەرۆك میتێـران بـووە، بیانووەکـەی سـەرۆك ئـەوەبوو بزانـێ کامیـان بـاس لـە نەخۆشییەکەی ئـەو دەکـەن، کـێ نهێنی نەخۆشـییەکەی دەدرکێنێـت، بـەوەش پەیوەندییەکـەی بـە (بینگـو) و کیژەکەی ئاشکرا نـەدەبوو، کە ئـەو لەگـەڵ ئـەو ژنـە نهێنییـە لـە ماڵێکی پارێزراودا دەژیـا، کـە لەسـەر ئـەرکی خەزینـەی دەوڵـەت کرێیـەکەی بـۆ دەدرا، بەڵام میتێران ئەو تاوانەی بە توندی رەتکردەوە کەوا ئەو فەرمانی دابێت گوێ لـە تەلـەفۆنی فەرەنسییەکان راگیرێـت، ئەوەشـی بەئاشـکرا لـە دیمانەیەکی تەلەفزیۆنی بەلژیکی لەساڵی ۱۹۹۳دا گوتبوو.

## دوو فڕۆکە بۆ گەشتەکانی خۆی

میتێران تا ژنی یەکەمی نەزانێت، بەردەوام کە سەفەری دەرەوەی فەرەنسای کردووە، ئەو بە دوو فڕۆکە سەفەری کردووە، خۆی بە فڕۆکەیەك‌و ژنە نوێیەکەشی فڕۆکەیەکی تایبەتی بۆ تەرخانکراوە، سەرکردە بێگانەکان‌و لە وڵاتانی دەرەوەش ئەوەیان دەزانی، میدیاش دەرکی بە شتێك کردبوو، بەڵام کەس یەك دێڕی لەسەر ئەو مەسەلەیە نەدەنووسی، ئەگەر نووسرابێتیش کەم‌و دەگمەن بووە، درۆکردن لە ژیانی ئەودا بەردەوام بووە تا ئاستی ئەوەی گەیشتۆتە بواری سازکردنی بڕیارە سیاسییەکانیش. ئێمە هەموو لایەکمان ئەوە باش دەزانین کەوا میتێران بەردەوام لێدوانەکانی نە نەخێرو نە نکوڵیکردن بووە، بەڵام ئەوەیان شاراوە نییە کەوا میتێران فەرمانی دابوو کە کەشتییەکەی دەستەی (گرین پیس) لە ناو ئاودا نقووم بکرێت، کە تایبەت بوو بە پارێزگاریکردنی ژینگە، کە تاقیکردنەوە ناوەکییەکانی فەرەنسییان سەرقاڵ‌و نیگەران کردبوو، لەودەمانە (رینبو وریر) لە ئۆقیانوسی ئارام خەریکی تاقیکردنەوەکانی ئاسایی ناوەکی خۆیان بوون، ئەوەش لە لایەن ئەدمیرال (بییر لاکوست) ەوە لە مانگی یولیۆی ساڵی ۲۰۰۵ پشتڕاست کراوەتەوە.

نووسەری فەرەنسی (تییری بفسنر) کە پۆستی وتەبێژی رەسمی سەرۆك وەزیران (بیار ماورو) ی لە حکومەتی میتێرانی ئیشتراکی نێونەتەوەیی هەبووە، بۆچوونێکی تایبەتی لەسەر گوتنی راستییەکان لە رەوشتی میتێران هەبوو، کەوا ژەنەراڵ دیگۆل جارێك بە ئاشکرا لەسەر مەسەلەی راستگۆیی گوتبووی:

(ڕاستییەکان! بڕوا دەکەیت من حکومەتێکی ئازادی فەرەنسا بە ڕووی ئینگلیزو ئەمریکییەکان لە ڕێگای ڕاستییەکانەوە دادەمەزرێنم...؟ ئێمە مێژوومان لەسەر بەرژەوەندیو تەمووح دەبێت، نەك لەسەر ڕاستییەکان).

مەبەستی نووسەرەکەش لە هێنانەوەی ئەو پەیڤەی دیگۆل ئەوەیە کەوا لەناو بیری تاکی فەرەنسی سەبارەت بە سیاسەت، درۆکردن نەریتێکی باوە، ئەوەی دەخوازێت پەیوەندی پێناسەی ڕاستییەکان بە ڕەوشتی سیاسییەوە ببەستێتەوە، کەسێکی نەفامو سادەیە، هەروەها وتوویەتی، فەرەنسییەکان بەتایبەتی دەستە سیاسییەکە، لە سەروبەندی دادگاییکردنەکەی سەرۆکی ئەمریکی بیل کلینتۆندا، تەنها خەمی ئەوەیان بوو ئەوان کۆشش بکەن نهێنی ژیانی تایبەتییان ئاشکرا نەبێت، بەتایبەتی ڕۆژانەی ژیانی سێکسییان.

## وەلامدانەوە زەحمەتەکە

پرسیارێك هەیە کە زەحمەتە وەلام بدرێتەوە، ئەویش ئەوەیە:

ئایا میتێران پەیرەوی رەوشتی رێگای نهێنیو تەمومژیو دەسەلاتە توندەکە دەکات لە مەسەلەی رەوشی تەندروستی...؟

ئایا ئەو کەسێك بووە دەسەلاتو پاوانکردنی لایەنە ئیجابیەکەی مەستی کردبوو...؟

من لە نزیکەوە چاودێری ئەو کەسەم کردبوو، من ئەو جۆرە ئارەزووانەم بەو شێوەیە لەو بەرجەستە نەدەکرد، من وا دەزانم نەخۆشییەکە فاکتەرێکی سەرەکی بووەو بەس، بەلام سەبارەت بە هەموو مەسەلەکانی میتێران، پیاو ناتوانێت لە هەموو شتەکانی تر دلنیا بێت.

## تۆماری سەرۆکایەتی ئەو

سەرۆك میتێران ئەوەی سەلماندووە کەوا سەرۆکەکان، کە نەخۆش دەکەون، ناتوانن لە بەر رەوشی تەندروستیو شێوەو بەرنامەی چارەسەرکردنەکانیان کارو فەرمانەکانی سەرۆکایەتی بە دروستی راپەڕێنن، دیارە ئەوانیش وەك خەلکی سادەن، لەگەل ئەواندا هیچ جیاوازییەکیان نییە، چارەسەرکردنی نەخۆشی کانسەر هەنگاوی باشی بڕیوەو زۆریش پێشکەوتووە، ئێستا خەلکی نەخۆش دەتوانێت شێوەکانی چارەسەری بە شێوەیەکی زۆر باش وەرگرێت، لەودەمانە

سەرۆك میتێران تەنها چارەسەری هارمۆنی وەردەگرت، ئەوەش لە چارەسەرییە شیمیاوییەکە بۆ جەستە سووکترە، لە سەردەمی حوکمی ئەودا لە نێوان سالانی ١٩٨١ تا ١٩٨٨ دەسکەوتی مەزن بە دەستهێنراوە. لە سەردەمی یەکەمی ولایەتەکەیدا زۆر چالاکبووە، ئەو (١٧٠٠) جار قسەی رووبەرووی لەگەڵ هاولاتیان کردووە، ئەگەرچی لەوەش دەترسا لە کاتی قسەکردندا دەنگی نەخۆشییەکەی دەربکەوێت، چونکە لە کاتی چارەسەرکردنەکەدا باندۆری لاوەکی نواندبوو. ئەو لەو ماوەیەدا سەفەری دەرەوەی ولاتی کردووە، لەوانە ٥٥ سەردانی رەسمی ولاتانی کردووە، لە ١٨ کۆبونەوەی ئەنجوومەنی ئەوروپیو شەش کۆبوونەوەی لووتکەیی بەشداربووە، ئەوەش مانای ئەوە نییە کەوا لەبەر نەخۆشییەکەی نەو دەبووایە لە ساڵی ١٩٨١ ەوە دەست لەکاربکێشێتەوە- یان لە ماوەی حەوت ساڵی یەکەمی سەرۆکایەتیدا هەموو ئەرکەکانی دروست راپەڕاندووە.

## داگیرکردنی کوێت

که سەدام حوسێن لە رۆژی ٢ ی ئۆگستی ساڵی ١٩٩٠ وڵاتی کوێتی داگیرکرد، بوار سازبوو سەرۆك میتێران هەموو دەسەلآتی خۆی بۆ مەسەلەی سیاسەتی ئاسایش بەکاربهێنێت، دەیویست بۆ ماوەیەکی تریش خودی خۆی بەرجەستە بکات، ئەو هاورێیە ئیشتراکییەکەی خۆی (میشیل رۆکار)ی کردبووە سەرۆك وەزیران، ئەویش چالاکانە کاری دەکردو لەناو خەلکیشدا بەرچاوو دیاربوو، بۆیەش دەسەلآتی میتێران لە پاش هەڵبژاردنەکەی سەرۆکایەتی لاوازو کەم دەبینرا، حەزی کردووە ئەو خۆی سەرپەرشتی ئەو کێسە دەولییە بکات، داواشی لە رۆکارکردووە پشوودانە دەریاییەکەی خۆی نەپچڕێنێت بۆ بە دواچوون لەو پێشهاتە نوێیەدا، میتێران ئارەزوومەندبوو لەگەڵ بەغدا پەیوەندییەکانی نەپچڕێنێت، بەڵام نەدەکرا پەیمان لەگەڵ ئەمریکاش نەکات بۆ بەکارهێنانی هێز دژی سەدام حوسێن لە کاتی پێویستدا، میتێران کەسێکی واقیعی بوو، دەیزانی رۆژی ئەوە دێت کەوا دەبێ هێز رەوانەی کەنداو بکات، ئەو هێزەش بە رێنمایی و سەرکردایەتی ئەمریکا دەبێت، ئەوەش لەلایەن وەزیری بەرگرییان (جان بیار شیفنمۆن)ی توندرەو رەفز دەکرایەوە، بۆیە داواکاربوو ئەو مۆڵەتەکەی نەپچڕێنێت. لە کۆتاییدا هەر سەرۆك میتێران کە بڕیاریداوە بە رەوانەکردنی هێزی سەربازی، کە لە لایەن نەتەوە یەکگرتووەکان بە دەنگی ٥٢٣ بەڵێ بەرامبەر بە ٢٥ دەنگی نەخێر بڕیاری لەسەر دراوە. لە رۆژی ١٤ ی مانگی سێپتەمبەری ساڵی ١٩٩٠ بڕیار دراوە کەوا فەرەنسا لە تیمی شەشەمی زرێپۆشی سووك پێنج هەزار سەرباز لەگەڵ پەنجا

فرۆکـه رەوانـەی شانشـینی عـەرەبی سـعودی بکـات، بـەوەش ١٢ هـەزار سـەربازی فەرەنسـی وەك بەشـێك لـە هێـزە فـرە ڕەگـەزەکان بەشـداری ڕاستەوخۆی شەڕەکەیان کردبوو. لە ڕۆژی ١٧ ی مانگی یەنایـەری سـاڵی ١٩٩١ هێزەکانی عێراقی لە بەرەکە لە ئاسمانـەوە مووشـەك بـاران کـران، بەڵام فەرەنسییەکان وەك بریتانییەکان ڕۆڵی سەرەکیو کاریگەریان لـە شەڕەکەدا نەبینیوە، بەوەش بەشێك لە فەرەنسییەکان بەو کـارە تـووڕە ببوون، لە ناوەوەش شـەپۆلێك نـاڕەزایی بـۆ ئاشـتیو هەڵوێسـتوەرگرتن لەسەر مەسەلەی عێراق بەرزکرایەوە، لە ڕۆژی ٢٠ ی مـانگی یەنایـەری ساڵی ١٩٩١ شیفنمۆن دەستی لەکارکێشاوەتەوە، بـەڵام لـەو لاوە میتێـران توندترو ئازایانەتر هاتۆتە مەیدان، لەو ماوە درێژەدا هـیچ شـوێنەوارو نیشانەی نەخۆشی لە ئاکاری میتێران دیارنەبوو.

## ئاشکرابوونی نهێنییەکە

لە ڕۆژی ١١ی سپتەمبەری ساڵی ١٩٩٢ ەوە نـەخۆشـییەکەی میتێـران ئاشکرا دەبێت، ئەوەش پاش ئەوە هات کە نەکرا نەشتەرگەرییەکەی بۆ کەمکردنەوەی فشاری پرۆستات لە سەر میزڵدانەکەی ئەنجام نـەدرێت. ئەو فشارەش لەئەنجامی گەورەبوونو ئەستووربوونی پرۆستات بوو کـە بـواری بـەتاڵکردنی میزڵدانەکـەی نـەدەدا، ئـەوەش یەکێکـە لـە نیشانە لاوەکییە ناڕەحەتەکانی بـۆری میزکـردن. پـێش نەشـتەرگەریو لەبـەر ئەسـتووربوونی پرۆسـتاتەکەی ئـەو بـەردەوام بـۆ میزکـردن بـە ڕێگـای توالێتــەوە بــوو. لــە ڕۆژی ٣ی ســێپتەمبەر، میتێــران لــە ســەر

رێکەوتننامـــەی ماســترێخت لەگــەڵ فیلیــب ســیگوین دیمانەیــەکی تەلـەفزێونییان هـەبوو، ئـەو شـەوە میتێـران دەبوایـە هـەر دە دەقـە جارێك کۆڕەکەی بۆ میزکردن جێهێشتبایە، بەڵام لەو کۆڕەدا تـەنها بـۆ کاتی ریکلامەکە پاوسێك هەبوو، لەوێ دەرکەوت ئەو ئیرادەی بەهێزەو ئازایانـە خـۆی پـێ رادەگیرێـت. بـەڵام کـە نەشـتەرگەرییەکەی بـۆ کـرا نـەکرا مەسـەلەکە بـەنهێنی بمێنێتـەوە، دکتـۆر گـوبلر رۆژێکیـان بـە سـکرتێری گشـتی کۆشـکی ئـالیزێ (هیـوبیر فیردیـن)ی وتـووە، کـەوا میتێران نەخۆشە، ئەو بە سەرسامییەوە وتبووی:

دیـارە لـەوەدا مەبەسـتت گاڵتـە کردنـە...؟ ئەگـەر وایـە چـۆن توانیووتە ئەو ماوە درێژە ئەو نهێنییە راگریت...؟

پـاش ئـەوەی نەشـتەرگەرییەکەی بـۆ کـرا، نەخۆشـییەکەی ئاشکرابوو، میتێران بەئاشکرا وتبووی، دکتۆرەکان شتێکی نامۆیـان لـە ساڵی ١٩٩٠ لـە مـن دۆزیوەتـەوە. ئـەو قسەیەشـی کردبـوو، ئـەوەك لـە دواڕۆژا شتێکی لـێ ئاشـکرابێتو تەنـدروسـتی شپرزەبێت. پاش ئـەوەی هەموولایەك زانییان کەوا میتێران دووچاری کانسەری پرۆستات بـووە، پـاش نەشــتەرگەریەکەش هێشــتا پــەردەیان لەســەر وردەکــاری نەخۆشـییەکەی دانـابوو. کـە دکتۆرێـك نموونەیـەکی لـە شـانەکانی جەستەی بۆ دڵنیابوون وەرگرتبوو، لە راپۆرتی دکتۆرەکە دەرکـەوتبوو کەوا لە نموونەکەدا کانسەری تێدابووە. داوا لە دکتۆرەکە نەکرابوو، لە هـەواڵی چارەسـەرکردنی میتێـران درۆ بکرێـت، بـەڵام داوایـان لـە دکتۆرەکـە کردبـوو، لـە راپۆرتەکـەی خۆیـدا ئامـاژە بـەوە نـەدا کـەوا دەرخستەی پشکنینی نموونەکـە بۆ چارەسـەری رەوشی تەندروسـتی

میتێران، پێویست دەکات چارەسەری شیمیاوی وەرگرێت. لە کۆشکی ئالیزێ حەزیان نەدەکرد بە هیچ شێوەو ئاماژەیەك باس لەوە بکرێت کەوا سەرۆك میتێران داوای لە دکتۆری ئامارو تۆماری شەش مانگەی خۆیاندا ئاماژە بە نەخۆشییەکەی ئەو نەکەن، باس لەوەش نەکرێت کەوا زووتر بە دەرمان‌و چارەسەری شیمیاویی بۆ بنبڕکردنی کانسەر چارەسەرکراوە، لەبەر ئەوە بۆ ماوەی ١١ ساڵ نەخۆشییەکەی بە شاراوەیی ماوەتەوە.

## حکومەتی هاوبەش

حیزبی ئیشتراکی لە هەڵبژاردنی ئەنجومەنی یاسادانان، کە لە کۆتایی مانگی مارسی ساڵی ١٩٩٣ ئەنجامدرا زەبرێکی کوشندەی بەردەکەوێت، کە تەنها ٢٠،٢٪ دەنگی لە کۆی دەنگەکان هێناوە. بۆیەش ژمارەی پەرلەمانتارەکانیان لە ٢٨٢ کەم دەبێتەوە بۆ تەنها ٧٠ پەرلەمانتار، ئەوەش نزمترین ژمارەیە لەوەتەی لە ساڵی ١٩٧١ ریفۆرمیان لەناو حیزبەکەیان کردبوو. کە لە ئەنجامی ئەو هەڵبژاردنەدا دوا سەرۆك وەزیرانی ئیشتراکی (ئار بیریغوفوی)ی سەردەمی میتێران دەگۆڕیت بە کاندیدی راستڕەوەکان (ئیدوار پالادور). لەسەردەمی دووەمی حکومەتی هاوبەشدا میتێران بە جۆرێکی زۆر جیاوازتر هەڵسوکەوت دەکات، کەسایەتی نوێی سەرۆك وەزیران زۆر دەوری دەبێت، لەودەمانەو لە سەردەمی ئەو حکومەتەدا

بەردەوام لەگەڵ جاك شیراك لەسەر دەسەڵاتو پۆستەكان ململانێو كێشەیان هەبووە، بەڵام لەگەڵ پالادورا شەریكایەتی پتەوو گونجاویان هەبوو.

من لە پاریس لە ١٧ ی ئەپریلی ساڵی ١٩٩٢ پالادورم بینی، ئەو كەسێكی زیرەك بوو، لەو دیمانەیەدا ئەو بە منی وت، من نیگەرانم لە بەشداری ژمارەی زۆرتری سوپاكەمان لە یۆگۆسلاڤیا. پالادور لە ئەزموونەكەی خۆیەوە هەستی بەوە كردبوو كەوا حكومەتی فەرەنسی دەتوانێت ئەركەكانی خۆی زۆر بە باشیو لێهاتووی بە سەرۆكایەتی میتێرانی ناساغ بەڕێوە ببات. بە مەرجێك ئەگەر هاوسەنگی لە بیركردنەوەو رامان لە نێوان سەرۆك وەزیرانو سەرۆكدا هەبێت.

بالادۆر لە بەردەم رووبەڕووبوونەوەیەكدا بوو، دەیویست پۆستی سەرۆك وەزیرییەكەی بۆ چەسپاندنی دەسەڵاتەكەی بەكاربهێنێت، تا خۆی نەك شیراك لەلایەن حیزبە راستڕەوە ناوەندەكانەوە وەك كاندیدی سەرۆكایەتی كاندید بكرێتەوە. لە ساڵی ١٩٩٣ بالادور كاتی زۆری بۆ ئەو بەرنامەیە دەویست، ئەو لە كتێبەكەی خۆیدا (دوو ساڵ لە ماتینو) دا نووسیویەتی:

نەخۆشییەكەی سەرۆك میتێران رۆڵێكی بایەخداری هەبوو لە تێڕوانینی فەرەنسییەكان لە من، من هیچم لەو بارەوە نەدەزانی، تەنها ئەو زانیاریانەی خۆی بە منی دەوت، ئەو زۆر بە درێژی قسەی لەگەڵ دەكردم، هەندێ جاریش قسەكانی زۆر وردەكاری تێدا دەبوو. ئەو دەیزانی من نهێنییەكان نادركێنم، كەوا من نەخۆشیو لاوازییەكەی ئەوم قۆرخ نەدەكرد بۆ دەسكەوتەكانی دەسەڵاتو سیاسەت، من ئەو

جۆره کارانەم بە شووردیی دەزانی، من ئەوەش دەڵێم هیچ هەست بەشانازی ناکەم ئەگەر من نەخۆشییەکەی ئەوم بۆ بەرژەوەندییەکانی خۆم بەکارهێنابێت.

هاوکاری میتێران لەگەڵ بالادور لە حکومەتە هاوبەشەکەیاندا بە شێوەیەك بوو، هیچ کەس لە لایەنگرانی لەگەڵ شیراك نەیانکردبوو، سەرنووسەری رۆژنامەی لۆمۆند لە ١٦ ی یولیۆی ساڵی ١٩٩٣دا وتبووی، کەوا میتێران ئەو جارەیان بیردۆزێکی دۆزیوەتەوە لە هاوژینی میسالی کە لەسەر بنەمایەکی سادەبوو، ئەویش رێکەوتن بووە لەسەر ئەوەی رێکنەکەوتنەکانیان لەسەر هەر مەسەلەیەك لەسەر کاروباری دەسەڵات نەکەنە کێشەو ململانێ، ئەگەر ئەو رەوشەش هاتە پێشەوە ئەوە ناکۆکییەکان باس بکەنو رەخنە بگرن، نەگاتە ململانێ لەسەر دەسەڵات، وەك ئەوەی کە لە ساڵی ١٩٨٦ روویداوە.

## مردنەکە

کە نەخۆشیەکەی فرانسوا میتێران (١٩١٦ ـ ١٩٩٦) دەزانرێت، زۆر باس لە شێوەو دەرمانی چارەسەرییەکانی دەکرێت، دکتۆر گوبلر بە وردی تۆماری دەکردن، بەڵام کە مانگی مایوی ساڵی ١٩٩٣ نەخۆشیەکەی دەگاتە مەترسی زۆرترو وردەکارییەکانی دەزانرێت، تەندروستی ئەو لە مانگی نۆڤمبەر زۆرتر دەبێت. بۆ چارەسەریەکان جۆرەها دەرمان، بە جۆرەها شێوەش ئامادە دەکرا، بۆیەش دکتۆرەکان لەسەر دەرمانەکانو

بەرنامەکانی چارەسەرکردنەکەش دەکەوتنە ناکۆکی بۆ باشترین شێوەی چارەسەری. پەیوەندی دکتۆر گوبلرو نەخۆشەکە لاوازو بڕوانەکردبوو، ژمارەیەکی زۆر لە دکتۆرەکان پێشبڕکێیان بوو لە چارەسەرکردنی سەرۆك، بەڵام گۆڕان و دەرمانی نوێ بۆ ئەو سوودی نەمابوو، چونکە تەندروستی ئەو بەرەو تەواوبوون دەچوو. لایەنێکی چارەسەرکردن هەبوو کە شیاوی باسکردن بوو، ئەویش گۆڕینی بەرنامەکانی چارەسەرکردنەکە بوو، بە هیوای پێشەوەچوونێك لە مانەوەو تەندروستی باشتر بەدی بکات، کە تەندروستی بەرەو ئاڵۆزیی دەچوو، میتێران بڕوای بە تیمی دکتۆرە راوێژکارەکانیشی نەمابوو، دیارە ئەوەش لەلای خەڵکی زۆر هەستی پێدەکرا، لەوانە بینگۆی ژنە دۆستەکەی میتێران لە رێگاو شێوازێکی تری هەتوان و چارەسەری دەگەڕا. بۆ دۆزینەوەی بوارێکی چارەسەری (روبیر)ی برای پەنای بردبووە بەر شێوەو بەرنامە نوێیەکانی ناو ئەمریکا ئەگەر هەبێت. لەودەمانە دکتۆر گوبلر پشتگوێ خرابوو، بۆیە چارەسەرییەکە بەر دکتۆر (میرکۆ بیلجانسکی) کەوتبوو، ئەو زووتر توێژەر بووە لە ئامۆژگەی باستورو دکتۆرای لە زانستەکانیش هەبوو، بەوە بەناوبانگ بوو کاری لە بواری چارەسەری بەدیل دەکرد، بۆ هەمان مەبەستیش و بۆ هێنانی زانایەکی هاوشێوەی دکتۆر میرکۆ، داوایان لە دکتۆر فیلیب دو کوبیبیریان کردبوو بێتە ناو کۆشك.

دکتۆر گوبلر ئەو ململانێیەی بەو شێوەیە کورت دەکاتەوە، ئەگەرچی بۆچوون زۆربوون، لەوانە ململانێیەکانی نێوان ئەوو پرۆفیسۆر ستیگ، کە ئەو لایەنگیری قوتابخانەی کلاسیکییەو لەگەڵ

کـوێبێرو بیلجانسـکی لـه قوتابخانـەی بەدیلـه. چارەسـەرییەکەی بیلجانسکی بەکارهێنانی گەردیلەی ناژەهراوی بوون کە لە بەرهەمە سروشـتیەکانەوە سـاز دەبـوون. ئـەوەش لـە گـەڵ چارەسـەرییە شیمیاوییەکەدا دەبوو، بەوەش نەخۆشەکە لە دەرچوونی ناخۆشی تـر دوور دەکەوتـەوە، کـە لـە ئـەنجامی بـەکارهێنانی مـادە شـیمیاوییەکە دەردەکـەوتن. کـوێبێر وایـدەزانی کـەوا مادەکـانی بیلجانسـکی باشـترین شـێوەی ئامادەیـە کـە بـۆ ئـەو نەخۆشـانە سـازبێت، بـەڵام ئـەوەی رەفزکردەوە کەوا ئەومیان لە حاڵەتی میتێران بەکار هاتبێت. میتێـران لە مانگی دیسمبەری ساڵی ١٩٩٤ بـۆ ئـەوەی دکتـۆر بیلجانسکی سـەیری بکات سەردانی ماڵەکەی دەکرد. لە دادگـای سان ئایتـان دۆزێـك لەسـەر ماف رەوای کارکردن لە بوارەکانی تەندروستیو دەرمانخانە دەکرێتـەوە، پاش دادگاییکردنەکە لە ئەپریلی ساڵی ١٩٩٥ بڕیـار دەدرێت دەزگاکـەی بیلجانسکی دابخرێت.

دووبارە بۆ چارەسەری نەخۆشییەکەی میتێـران چارەی هـارمۆنی لەگـەڵ چـارەی شـیمیایی تێکـەڵ دەکـەن، هـەر بـۆ ئـەو مەبەسـتەش چارەسـەرکردنی بـەدیلیش پـەیڕەو کـراوە، بـەڵام رەوشـی تەندروسـتی چاك نابێتـەوەو میتێـران دەکەوێتـە سـەر جێگـاو ماوەیـەکی درێـژیش لەسەر جێگا دەمێنێتەوە. لە مانگی نۆڤمبەری ساڵی ١٩٩٤ دکتـۆر گـوبلر کـە هـاوجێی نەخۆشـەکە دەبێـتو چارەسـەری پێشـکەش دەکـات، لـە ململانێیەکانی تیمە چارەسەرکرنەکەش نیگەران دەبێت. گوبلر دەگاتە ئـەو قەناعەتـەی کـەوا سـەرۆك میتێـران چیـتر ناتوانێـت کارەکـانی راپـەڕێنێت، ئـەو بـە هـۆی دەنگـی فەرەنسییەکانەوە بـۆ ئـەو ئەرکـە

دەستنیشانکراوە، بەوەش ئەو ناتوانێت وەکالەتەکە بکات، لە مانگی دیسمبەردا دەنگی ئەو دەگۆڕێت و تاقەتی قسەکردنیشی نامێنێت. دکتۆر گوبلر هەر شەش مانگێك جارێك راپۆرتێك لەسەر رەوشی تەندروستی ئەو پێشکەش دەکات، بەڵام لە دوا راپۆرتیشدا راستییەکان لەسەر تەندروستی ئەو وەك خۆی باس ناکات. ئیتر لەو دەمانە وەك دکتۆری تایبەتی ئەو نەمابوو.

دکتۆرەکە هەشت مانگ بوو لە پۆستەکەی نەمابوو، کە لە رۆژی ٨ ی مانگی یەنایەرو لە تەمەنی ٧٨ ساڵییداو پاش راگرتنی دەرمانەکان، فرانسوا میتێران دەمرێت. ئەودەمانە دکتۆر جان بییر تارۆ دکتۆری تایبەتی ئەو بوو، پاش مردنەکە تەلەفۆن بۆ بینگۆو مارازینی کیژی دەکات، لە پاش ئەوان تەلەفۆنیش بۆ دانیال میتێران و منالەکانی ئەویش دەکات. پاش ماوەیەکی کەم لە مردنی میتێران دکتۆر گوبلر ویستبووی کتێبێك لەسەر ماوەی مانەوەی لەگەڵ میتێران دەربکات، لەو کتێبەدا وەك دکتۆری تایبەتی ئەو قسە بکات، بەڵام بواریان نەدا دکتۆرەکە کتێبەکە دەربکات، دانیال میتێران و منالەکانی لە دادگا شکایەتیان لەو کردبوو بڕیاریش درا دکتۆرەکە لەو کارە راگرن، چونکە ئەومیان دەستێوەردانە لە ژیانی تایبەتی ئەو خێزانە. دادگا بڕیار دەدات ئەگەر ئەو کتێبە چاپ بکرێت سزای پارە وەرگرتن بخرێتە سەر فرۆشتنی هەر کتێبێك، چونکە یاسای فەرەنسی مافی ئەوەی داوە بە هەموو کەس لایەنی تایبەتی تا ماوەی زیاتر لە ١٥٠ ساڵ بپارێزێت. پاش چەند هەفتەیەك لەو بڕیارەی دادگا، کتێبەکە بە زمانی ئینگلیزی لەسەر ماڵپەڕەکان بڵاودەبێتەوە. لە مانگی مایسی ساڵی ١٩٩٦

کتێبەکـە لـە چـەند شـوێندا لـە ولایەتـە یـەکگرتووەکانی ئـەمریکا دەفرۆشـرا، هـەروەها فەرەنسـییەکان بەئاسـانی لەسـەر ماڵپـەڕەکان کۆپییان دەکرد. کە ماڵپەڕە فەرەنسییەکە دادەخرێت، هاوڵاتیان لەسەر ماڵپـەڕە ئەمریکییـەکان سـەیری کتێبەکـە دەکـەن، بـەومش بۆچـوونی دکتـۆر گـوبلر لەسـەر نەخۆشـییەکەی میتێـران دەخوێندرایـەوەو بڕیارەکـەی دادگاش لەسـەر پاراسـتنی تایبەتمەنـدی تاکـە کـەس ڕۆڵـی نـەبینی. دکتـۆر گوبلر لەسـەر بڵاوکردنـەوەی کتێبەکـەی کۆڵ نـادات و کێشـەکە دەباتـە دادگـای ئـەوروپی مافـەکانی مـرۆڤ، لـەوێ بڕیـار وەردەگرێت کەوا بڕیارەکەی دادگای فەرەنسی بە گوێرەی مادەی دەیەم لە بەلگەنامەی ئـەوروپی بـۆ مافـەکانی مـرۆڤ حـەقی نییـە کتێبەکـەی دکتۆر گوبلر قەدەغە بکات.

# بەشی حەوتەم

## ئەنتۆنی ئایدنو ئەخۆشی

## دێوەزمەی عەبدولناسرو شەڕی سوێس

ئەنتونی ئایدن لە ژیانی سیاسیدا بەختەوەر بووە، لە تەمەنی بیست و شەش ساڵیدا دەبێتە ئەندامی پەرلەمانی بریتانی، لە تەمەنی سی و هەشت ساڵیدا دەبێتە وەزیری دەرەوە، کە دەکاتە گچکەترین وەزیری دەرەوەی بریتانی لە سەدەی بیستەمدا، لە ٢٠ ی فبرایەری ساڵی ١٩٣٨ لەبەر هەڵوێست وەرگرتن لە سەرۆك وەزیرانەکەی (نیفیل شیمبرلین) لە پێشنیارەکەی سەرۆکی ئەمریکی فرانکلین رۆزفلت سەبارەت بە ئەوروپا وازدەهێنێت، بەڵام لە حکومەتەکەی وینستۆن تشرشل لە ساڵی ١٩٤٠ پۆستی وەزارەتی بەرپرس لە سوپا وەردەگرێتەوە، کە تشرشل متمانە بە لۆرد هالیفاکس ناکات، وەك سەفیر رەوانەی واشنتۆنی دەکات، دووبارە ئەو دەبێتەوە وەزیری دەرەوە. کە لە ساڵی ١٩٤٥ تشرشل هەڵبژاردنە گشتییەکە دەدۆڕێنێت، ئەو دەبێتە جێگری سەرۆکی حیزبی پارێزگاران لە ئۆپۆزسیۆندا، کە دووبارە پارێزگارەکان هەڵبژاردنەکەی ساڵی ١٩٥١ لە حیزبی کرێکاران دەبەنەوەو حکومەت وەردەگرنەوە، ئەو دەبێتەوە وەزیری دەرەوە، بەوەش ئەو ماوەی دە ساڵ وەزیری دەرەوەی بریتانی بووە.

## ژنـان عـاشقی ئەو دەبن

ئایـدن پیـاوێکی فـۆرم جـوان بـوو، زۆر لـە ژنـان لـە نـاو حیزبـی پارێزگاران عاشقی دەبن، ئـەو لـە نـاو هـەموو بەشـەکانی حیزبەکـەیان خۆشەویست بوو، بۆیـەش دەبـێ ئـەوە بڵێن کـە تشرشـل لـە سـاڵی ١٩٤٩ دووجار تووشـی سـەکتەی دڵ دەبێـتو بەیـەکجاری خانەنشـین دەبێـت، دەبوایـە بـوار سـاز بکـات ئـەنتونی ئایـدن سـەرکردایەتی هەڵمـەتی هەڵبــژاردنی حیزبەکــەیان بکــات. بــەڵام ئــەو دەمێنێتــەوەو خــۆی سـەرکردایەتی حیزبەکـە دەکـات. ئـەنتۆنی نائومێـد دەبێـت لـەوەی سـەرۆکە پیرەکـە وا بەئاسـانی گۆڕەپانەکـە چـۆڵ بکـات، کـە مـاوە مـاوە دەردەکەوت، ئەو چاوەڕوانییەش وا دەکات بە تـووڕەیی‌و نیگەرانییـەوە ببینرێـت، زۆریـش لەسـەر مەسـەلەیەکی سـادە ئـەو هەڵدەچـوو، ئـەو رەوشــتەی کاریگــەری لەســەر کەسـایەتییە ســیحراوییە شـیرینەکەی هەبوو.

## بەدبەختی

کـە ئایـدن نـەخۆش دەکـەوێت هـەر بـۆ خـۆی بەدبـەختی نـەبوو، بــەڵکو دبلۆماســیەتی نێودەوڵــەتیش لــەو ســاڵانە زەرمەرمەنــد ببــوو، نەشتەرگەرییەك بۆ لابردنی زراوی بۆ دەکەن، بەڵام نەشـتەرگەرییەکە سـەرناگرێت، نەشـتەرگەرییەکە بـە رێنمـایی سـێر (هـۆراس ئیڤـانز)ی پزیشکی تایبەتی خـۆی بـووە، پـاش ئـەوەی چـەند جارێك هەسـتی بـە

ژانەسك كردووەو هەستكراوە لەناو سكیدا چەند هێلكەو بەردێك هەیە. ئیڤانری دكتۆرە تایبەتییەكەی پێشنیار دەكات سێ نەشتەرگەری جیاواز كە لە نەشتەرگەری بۆریەكانی میزڵدان شارەزان نەشتەرگەرییەكەی بۆ بكەن، بەلاَم ئایدن پێشنیارەكەی پێ باش نابیت، ئەو دكتۆرێك بۆ ئەو كارە پێشنیار دەكات كە ناوی (جۆن هیوم)ە، كە تەمەنی ٦٠ ساڵەو دەڵێت:

هیوم لە تەمەنی گەنجیمدا نەشتەرگەری ریخۆڵەكوێرەی بۆ كردووم، من دەچمەوە لای ئەو. بۆیە ئەو پێشنیارەكەی هیوم پەسند ناكات.

## دووەمەكەیان زۆرتر نیگەران بوو

نەشتەرگەریەكە دوو قۆناغ دەبێت، یەكەمیان یەك سەعات دوا دەكەوێت چونكە دكتۆر هیوم نیگەران بووە، كە هەست دەكات ئارام دەبێتەوە، دەڵێ من ناتوانم سەرپەرشتی بكەم، دووەم نەشتەرگەریەكە بكەم، بۆیە دكتۆر (گای بلاكبیرن) یاریدەدەرەكەی سەرپەرشتی بەشی دووەمەكەی دەكات، ئەو وتبووی، ئەو بەشەیان لە یەكەمیشیان ناخۆشتر بوو، من زۆرتر نیگەران بووم، لەو نەشتەرگەریە درێژە ئایدن هاتبووە بەر مردن. نووسەری بیرەوەریەكەی ئایدن كۆكە لەسەر ئەوەی كەوا بەشێك لە كەناڵی زراویان بە هەڵە لە نەشتەرگەریە یەكەمەكە بۆ بڕیبوو. بە ئایدنیان وتبوو، مقەستەكە لە دەستمان دەردەچوو، یەكێك لەو كەسانەی لە نەشتەرگەریەكە ئاگاداربوو،

وتبووی:

لـــەو دوو قوناغـــەی نەشـــتەرگەریەکەدا هەڵەکـــە لەلایـــەن خوێندکارێکی گچکەوە بوو کە لە نەشتەرگەریەکەدا. دەستی هەبوو، بەڵام سوودی نەبوو.

وینســـتۆن تشرشـــل وەك ســـەرۆك وەزیـــران چـــاودێری چارەسەرکردنەکەی ئایدنی دەکرد، بەڵام کارەکانی سوودی نەبوو، دکتۆر زۆر بەبایەخەوە باسی نەخۆشەکەی کردووە. ئەو ئایدنی وەك کەسایەتییەکی دیارو بایەخدار بینیووە، هەروەها پاش هەردوو نەشـــتەرگەریەکەی ئایـــدن، تشرشـــل رۆڵـــی بینیـــووە پـــاش نەشتەرگەریەکەی لەندەن ئەوجارە نەخۆشەکە رەوانەی ئەمریکا دەکەن، تا لەوێ سێیەم نەشتەرگەری بۆ بکەن.

## دەستێوەردانی تەواو، بەڵام بێ سوود

پسپۆرو شارەزای بواری نەشتەرگەری (ریتشارد کاتیل) کە لە سەر ئاستی نێودەوڵەتیدا ناسراو بوو، بەرێکەوت لە لەندەن بوو، بۆ پێشکەشکردنی وۆرك شۆپێك لەوێ بوو، بۆیە ئەو رێکەوتە بەهەلزانرا ئایدن بپشکنێت، کاتیل سوور بوو لەسەر ئەوەی ئایدن بۆ پشکنین‌و چارەسەری بگوازرێتەوە بۆ شاری بۆستن تا نەشتەگەری سێیەمی بۆ بکرێت، ئایفانز لەسەر پێشنیارەکە رازی دەبێت، بەڵام لۆرد مۆزان کە

دکتۆری تایبەتی ئایدن دەبێت، بۆچوونی وابوو کەوا دەکرێ ئەو نەشتەرگەریە لە لەندەنیش بکرێت. سەرەتا تشرشل وای دەزانی ناردنی وەزیرێکی ئەو بۆ دەرەوەو بۆ چارەسەر سوکایەتییە بۆ بریتانیا، بێگومان (مۆران)یش پشتی دەگرت، بەڵام ئەو لەسەر بۆچوونەکەی خۆی توندبوو، بۆیە بەناچاری هەریەك لە ئیڤانزو کانیل لە بارەگاکەی خۆی لە ١٠ داونگ ستریت سەردانیان کردبوو. لەناو هۆڵی کۆبونەوەی ئەنجومەنی وەزیراندا تشرشل لەسەر ئەو مەسەلەیە قسەی کردبوو، لەوێ وتبووی نەشتەرگەری ریخۆڵە کوێرە دەکرێ لەسەر مێزێك یا لە مەتبەخێکیش بکرێت وەك یەك وایە، بۆیە پێویست ناکات ئایدن بچێتە ئەمریکا، بەڵام هەردوو دکتۆرە میوانەکە، وتبوویان راستە نەشتەرگەری ریخۆڵە کوێرە دەکرێ بەئاسانی بکرێت، بەڵام نەشتەرگەریەکەی ئەو وا ئاسان نییە، دورینەوەی پچڕانی کەناڵی زراوەو ئەویش پسپۆڕی زۆری دەوێت.

## لە کار وەستانی مێشکی چەرچل

لە رۆژی ٢٣ ی یونیوی ساڵی ١٩٥٣ دا لە بۆستن نەشتەرگەرییەکی زەحمەت بۆ ئایدن کرابوو، لەو رۆژەوە تشرشل لە ئاهەنگێکی ئێوارە خوانێکدا کە لەسەر شەرەفی سەرۆك وەزیرانی ئیتاڵی (دی گاسپیری) کرابوو، دووچاری سەکتەی مێشك دەبێت، لە ئەنجامدا و لەناکاو هاوسەنگی تێکدەچێت و قسەکردنەکە پچڕپچڕ دەبێت. لە بەیانی رۆژی دوایی دەستی چەپی ئیفلیج دەبێت، بۆیەش لە کاتی رۆیشتنیدا

دەبووایــــە دەســــتی بگــــرن، بــــەلام ئــــەو بەیانییــــە ســــەرۆکایەتی کۆبوونەوەیـەکی ئەنجومـەنی وەزیـرانیش دەکـات. پـاش کۆبوونەوەکـە مـۆران، بـە دوای سـێر راسـل بریـنـدا دەنێرێـت، ئـەویش حاڵـەتی نەخۆشییەکە بە سەکتەی مێشك دەستنیشان دەکات، بەلام حاڵەتەکە زۆر دژوار نابێـت، لـەو رەوشـەدا تشرشـل دەتوانێـت رێ بکـات، بـەلام رۆیشتنەکەی لەسەرخۆ دەبێتو دەلەنگێت.

پـاش پشـکنینەکە تشرشـل وتارێـك لەسـەر سیاسـەتی دەرەوەی (بریتانیـا) پێشـکەش دەکـات، لەودەمانـەش تشرشـل بـاس لـە کێشـەی ئایدنیش دەکات، سەبارەت بەوە تشرشل دەڵێت:

ئەگەر ئایدن گەڕایەوەو لە پۆستی وەزارەتی دەرەوەش نـەما، ئـەوا پـاش ئەو رۆژە، ئـەو هـیچ پۆسـتی تـر وەرناگرێـت. بـاس لـەوەش کـرا ئەگـەر تشرشـل لـە بـەر خراپـی رەوشـی تەندروسـتی لـە پۆسـتەکەی ئیستقالەی دا ئەوا پۆستی سەرۆکایەتی وەزیران بە (باتلر) دەسپێرن.

## کەسێکی زۆر زیاتر ناسراو

لە ئـەمریکا ئایـدن چارەسـەر دەکرێـتو دەگەڕێتـەوە لەنـدەن، بـە رەوشێکی باش کاروباری وەزارەتەکەی بەڕێوە دەبات، ئەگەرچی ئەو لە ساڵی ١٩٥٥ سـێ جـار لـەرزوتا دەگرێـتو سـەرمای دەبێـت، بـەلام نەخۆشـیەکە بـە سـووکی دەگرێـتو ناکـەوێت. ئایـدن پـاش نەشتەرگەریەکە هەست دەکات رەوشی زۆر ئاساییەو دەتوانێت لە پاش تشرشلیش پۆستی سەرۆکایەتی ئەنجومـەنی وەزیـرانیش وەرگرێـت، لـە

رۆژی ٦ ی ئەپریلی ساڵی ١٩٥٥ تشرشل لە پۆستەکەی نامێنێت، بۆیەش ئایدن داوای هەڵبژاردنی پێشوەخت دەکات، لەو هەڵبژاردنەدا ئەو زۆرینەی دەنگی ئەنجومەنی عموم بەدەست دەهێنێت، لەودەمانەدا هەموو لایەك ئاماژەیان بەوە دەدا کەوا ئەو لە هەموو سیاسەتمەدارەکانی تر شایانی ئەو پۆستەیە.

لە ساڵی ١٩٥٥ بۆ سەرۆکایەتییەکەی ئایدن کات و سەردەمێکی ئەستەم بوو، لە رۆژنامەکاندا هەڵمەتێکی توندو دژواریان دژی دەکرد، بە تایبەتی ئەو وتارەی کە لە رۆژنامەی دەیلی تەلەگراف لە رۆژی ٣ی یەنایەردا کە لە بەرژەوەندی پارێزگارەکان بوو، تێیدا نووسرابوو، کەوا خەڵکەکە چاوەڕوان بوون حکومەتەکەی ئایدن بەهێزترو بوێرتر بوایە، ئەوەش کاریگەری لەو کرد، بۆیەش هەڵسوکەوتەکانی بەرەو زۆر توندتر دەگۆڕێت، بەتایبەتی کە قەیرانی کەناڵی ئەلسویس روودەدات. لە مانگی مارسداو لە ئاکامی دەمەتەقێیەکی توند لە سەر ئوردن، ئایدن کۆنترۆڵی لە سەرخۆ نامێنێت و توورە دەبێت، بۆیەش لە ناو ئەندامانی پەرلەمان بە دەنگی بەرز داوای لێدەکەن، دەست لەکاربکێشێتەوە. روبرت رودس جیمس ئەوەی ژیاننامەی ئایدنی نووسیوەتەوە، ئەو دەڵێ:

کلارسیای هاوسەری لە رۆژانەی خۆیدا لە رۆژی ٧ ی مارس تۆماریکردووە، کەوا رووداوەکانی ئوردن زۆر ئەنتۆنی هەژاندووە، کە ماندوو هەراسانی کردووەو تاقەتی بیرکردنەوەو وزەی نەمابوو. بەلآم لە کتێبەکەیدا کە لە سەر ئەو رۆژانە نووسراوە، ئەو نووسیویەتی:

رووداوەکانی ئوردن کاریگەری زۆری لەسەر ئەو هەبووە، بەلآم

ئەو ئاماژە بەوە نادات کەوا هەراسانی کردبێت. ژەنـراڵ (جۆن بـاغوپ گلۆب) سەرکردەی سەربازی بریتانی لە ناو سوپای ئوردنی، لەلایەن شا حوسێنەوە لادرابوو، بۆیەش ئایـدن لـەومیان گلـەیی لەسـەرۆك جـەمال عەبدولناسر دەکات کەوا هانی شاحوسێنی داوە ئەو فەرمانـە دەربکات. (ئەنتۆنی ناتینگ) کە لەودەمانە جێگری وەزیری دەرەوە بوو، باس لـە وڕێنـەو تووڕەییـەکانی ئەودەمانـەی ئایـدن دەکـات، کـەوا ئـەو لـە نـاو تەلەفۆنەکەیدا هاواری کردووەو وتوویەتی:

ئـەو قسـە بـێ مانایانـە چییە کـە دەڵـێن: جـەمال عەبدولناسـر پەراوێز بکەن، یان گۆشەگیری بکەن، وەك باسکراوە، من ئەوە ناخوازم، مـن دەمـەوێ بیڕوخێـنن، تێدەگەن...؟ ئەگـەر ئێـوەو وەزارەتـی دەرەوە ئەوە قبووڵ ناکەن، دەبـێ لـە ئەنجومـەنی وەزیـران ئامادەبن، تـا بـاش بۆتان شرۆڤە بکەم.

## جەمال عەبدولنـاسر

بریتانیـا لـە سـاڵی ١٨٨٢ تـا سـاڵی ١٩٥٢ حـوکمی وڵاتـی میسـری کردووە، بەردەوامیش لەسەر حوکمی پاشایەتی دەسـەڵاتی هـەبووە، تـا ئەو ساڵەی جەمال عەبدولناسر حکومەتەکەی شا فاروق دەڕوخێنێت. ئایـدن و ئـەوەی ئایـدن وا دەزانـن کـەوا هاتوچۆی دەریـایی لـە کـەناڵی ئەلسویس بـۆ بریتانیـا مەسـەلەیەکی زێـدە زینـدووە، بۆیـەش ئایـدن ڕاستەوخۆ دژایەتی کەسایەتی جـەمالی دەکـرد، ئـەو تـەنها جارێك کـە وەزیری دەرەوە دەبێت لە قاهیرە دەیبینێت.

لـە بیرەوەرییـەکانی کلارسـیای هاوسـەری ئایـدن لـە رۆژی ٢٠ی یەنایـەری سـاڵی ١٩٥٥ نووسـراوە، کـەوا ئایـدن بـەو شـێوەیە پێناسـەی جەمال عەبدولناسری کردووە: ژەنراڵ ناسر تەمەنی سی‌و پێنج ساڵێك دەبێت، لە وڵاتی میسر دەرنەچووەو کەسێکی شاراوەو تەموەزاوییـە، بـە شـێوەیەك لـە شـێوەکان کەسێکی بـەڕێزەو زمانـە ئینگلیزییەکـەی خـراپ نییـە. کـە لەگـەڵ ئایدن دیمانەیـەکیان بـووە پاشـان زانـرا کـەوا جەمال تووڕەبووە، چونکە ئایدن سەردانەکەی بە شێوەیەك بووە کـەوا هاتۆتە دیمانەی سەرۆك دەوڵەتێك، چـونکە ئـەو بـە بەدڵـەی رەسمـی‌و ملپێچی رەش دەبێت، کە دەزانێت ئایدن بە عـەرەبیش قسـەی لەگەڵدا دەکـات نارەحـەت دەبێـت. ئایـدن لـە سـاڵی ١٩٥٤دا لەسـەر مانـەوەی هێزەکـانی بریتـانی‌و کێشـەی کـەناڵی ئەلسـویس تونـدو ئازایانـە دانوستانیان لەگەڵدا دەکات، ئـەوەش بـە دڵـی تشرشـل نابێـت‌و لـە نـاو جەماوەری حیزبی پارێزگارانیش رەخنەی توندی ئاراسـتە دەکـەن، کـە لە ئەنجامی ئەو دانوستانەدا دوا سەربازی بریتانی لە رۆژی ١٣ ی یۆنیۆ ساڵی ١٩٥٦ لە شاری پۆرسەعید دەردەچێت.

## کۆمەك بۆ بەنداوی ئەلعالی

کۆبوونـەوەیەکی لوتکە لـە نێـوان ئـەمریکاو بریتانیـا بـۆ کۆمـەکی بەنـداوی ئـەلعالی لـە ئەسـوانی خـواروی میسـر کـرا، لـەوێ ئایـدن نوێنەرایەتی بریتانیای کردبوو، لەو دەمانـەدا سـەرۆك ئایزنهـاوەر لـەو نەخۆشییەی تووشی ببـوو چـاك دەبێتـەوە، وەزیـری دەرەوەشـی (جۆن

فۆستر دالس) سەرقاڵی پەرەسەندنی دەسەڵاتی سۆڤیەتی بوو لە میسر، بۆیە حەزیان نەدەکرد کۆمەکی پرۆژەی بەنداوەکە بکەن. لە رۆژی ١٧ی یولیۆدا سەفیری بریتانیا لە ئەمریکا پەیامی وڵاتەکەی گەیاندە ئەمریکییەکان، کەوا بریتانیا لەگەڵ پرۆژەکەدایەو نایەوێ ئەمریکا لەومیانــدا بکشێتەوە، بۆیــەش دالــس مەزنــدەی وابــوو، لەوەشــیاندا راستبوو کەوا بریتانیاییەکان تەنها مەبەستیان هەڵوێست نواندن بوو، دالس کە فشاری کۆنگریسی لەسەر دەبێت، کەوا ئەمریکییەکان لە رۆژی ١٩ی یولیۆدا دەکشێنەوە.

لە لەنــدەن ســەرۆکی ئەنجومــەنی بازرگــانی (بــیتر پورنیکرۆفت) دەچــێتە لای ئایــدن تــا ئــەو رازی بکــات پرۆژەکــەی بەنــداوی ئــەلعالی نەوەستێت، لەو داوایەی پورنیکرفت ئایدن توورە دەبێ، کە چۆن ئەو دەست لەکاروباریان وەردەدات، بۆیە وتبووی:

بڕیاری ئەمریکییەکان لەسەر پرۆژەکە، بڕیاری کۆتایی لەسەر دراوە، بۆیــە قســەکردن لــە نۆژەنکردنــەوەی بەرنامەکــە مەســەلەیەکی نــەگونجاوە. ئــەو هەڵوێستەی ئایــدنیش نیشــانەی هەڵچوونو مەزاجــە ناخۆشەکانی بوو. لە پاش شەش رۆژ ســەرۆك جــەمالو لــە رۆژی ٢٦ی یولیۆ، واتە رۆژی یادی دابەزینی شا فاروق لە عەرشەکەی لە وتارێکی جەماوەریدا بەجۆشەوە کە لە گۆڕەپانی ئەلمنشیە پێشکەشی کردبوو، کــەناڵی ســوێس خۆمــاڵی دەکــات. ئــەو هــەنگاوەش بەشــێك بــوو لەکاردانەوەیــەکی تایبــەت لەســەر پرۆژەکــە، کــە بــاس لــە وتارەکــەی جەمال عەبدولناسر دەکرا لەو دەمانە ئایدن لە سەر خــوانێکی ئێــواران دەبێت لە بارەگاکەی لە ١٠ دواننگ ستریت، لەسەر شــەرەفی شا فەیسەڵ

شای عێراق و سەرۆك وەزیرانەکەی نوری سەعید سازکرابوو، لەوێ عێراقییەکان ئامۆژگاری ئایدن دەکەن، کەوا زەبرێکی کوشندە لە جەمال عەبدولناسر بووەشێنێت. لەو ڕۆژەشدا ئایدن داوای نوێنەرایەتی کاروباری ئەمریکی دەکات، دیارە کەوا مەسەلەکە سەرنجڕاکێشەو سەیرە لەگەڵ ڕۆژەڤی ڕۆژەکانی سەرەتا بۆ بەشداریکردنی ئەمریکییەکان لەو پێشهاتەدا، هەر لەو دەمانەدا بانگی سەفیری فەرەنسیش دەکات، تا بە یەکەوە باس لە مەترسییەکانی قاهیرە بکەن، لەو دیمانەیەدا چوار وەزیریش بەشدار دەبن لەوانە هاوڕێ نزیکەکەی خۆی وەزیری دەرەوە سلوین لویدو مارکیز سالزبوری و کۆنت کلیمیورو سەرۆکی قەزاو سیر ئالیك دوگلاس هیوم، هەروەها لەو کۆبوونەوەیەدا بانگی هەردوو سەرۆکایەتی ئەرکان، ئەلفیلد مارشال سیر گیرالد تیمبلرو ئەدمیرال ئایرل مونتیاتن دەکات، کۆبوونەوەکە تا سەعات چواری بەیانی بەردەوام دەبێت.

سەرۆك وەزیرانی بریتانی دڵنیابوو لەوەی خۆماڵیكردنی كەناڵی ئەلسوێس زەبرێكی كوشندەی راستەوخۆ لە بەرژەوەندییەكانی بریتانی دەدات، بۆیەش سەركردەی میسری جەمال عەبدولناسری لە ساڵی ١٩٥٦ بە مۆسۆلینی (سەركردە فاشییەكەی ئیتالی) ساڵانی سییەكانی سەدەی رابردوو دەزانی، ئایدن بەئاشكرا وتبووی بە هیچ شێوەیەك قبووڵمان نییە عەبدولناسر (بمانخنكێنێت)، ئەوەشی دووپاتكردۆتەوە كەوا ئامادەیە بە هێز بەرامبەر ئەو گوشارە بووەستێت و فشارە میسرییەكە لە سەر كاروانی دەریایی بریتانی هەلگرێت، دووبارە كەناڵەكە وەك جاران بكرێتەوەو دانەخرێت. لە راستیدا وڵاتی میسر مەبەستی نەبوو دەست لە بواری كاروانی هاتوچۆی پاپۆڕی وڵاتەكان وەربدات و كاروانەكە بگرێت، بۆیەش تەنها چەند وڵاتێك ترسیان لەو هەنگاوە هەبوو لەوانە وڵاتی ئیسرائیل. بەرنامەی خۆماڵیكردنی كەناڵەكەش لە لایەن جەمال عەبدولناسرەوە زۆر زیرەكانە كرابوو، دوور نەبوو لە پرنسیپە یاساییەكان، بڕیاریش بوو بەشی سەهمەكان لە بۆرسەی پاریسدا بكڕێتەوە، ئەو دەمانەی كە سەرۆكی میسری ئەو بڕیارەشی دەردەكرد، رای گشتی جیهانیش بایەخیان نەدەدا، بەوەی ئایا پەیوەندییەكانی میسرو یەكێتی سۆڤیەت گەشە دەكات یان نا، سەرۆكی ئەمریكیش ئایزنهاوەر (١٤ ی ئوكتۆبەر ١٨٩٠ _ ٢٨ ی مارسی ١٩٦٩) ئەو بابەتە بەوە نابەستێتەوە كەوا سۆڤیەتییەكان مەبەستیانە ئەو كەناڵە بكەنە پێگەیەكی مەترسیدارو سۆڤیەت وەك دیاردەیەكی مەترسی بكاتە ناوچەكە، بەوەش دەركەوت كەوا ئەو كەسایەتییەكی زۆر گرنگ بووە لە ئەنجامەكەی قەیرانی كەناڵی ئەلسویسدا.

## ئایدن خۆی ساز دەکات

کە سەرۆکی میسری لە رۆژی ٢٦ ی مانگی یولیۆدا وتارەکەی پێشکەشکردووە، یەکسەر ئایدن خۆی ساز دەکات، ئەگەر هێرشە سەربازییەکە ماوەیەك دوا بکەوێت لەو پرۆسەیەدا پێشهاتێکی ئاساییە، چونکە بڕیاری سەرۆکایەتی ئەرکانی کاتی دەوێت، ئەویش بۆ ئەو هێرشە لەناکاوە زۆر ئامادەو ساز نەبوو، زۆریش لەگەڵ هێرشەکەدا نەبوو. ئەو بڕیارەی ئایدنیش ئەو جارەیان زۆر هەستیار بوو، ئەوەش بەپێچەوانەی مەسەلە هەڵچووەکانی ئەو بووە لە پاش بڕیارەکانی پاش رۆژی ١٤ ی ئوکتۆبەر، کە رەوشی تەندروستییەکەی فاکتەرێکی گرنگ بووە. بۆ رۆژی دوایی پاش وتارەکەی عەبدولناسر، ئایدن بۆچوونە یاساییەکەی کیلمبوریش یەکسەر بە هەند وەرناگرێت، کە بریتانیا لە کەناڵی ئەلسویس دەیەوێت هێرشی سەربازی بکات، ئەوەش لەسەر بنچینەی ئەوەی کەوا بڕیارەکەی جەمال نایاساییە، هەروەها گوێیش ناداتە بۆچوونەکانی کۆنە هاوڕێ کۆنت (سیلسینین)ی کەوا ئەودەمانە لوردێکی ئەدمیراڵی بوو، کە وتبووی:

ئەگەر ئەو پێشهاتە کارو زەبرێکی سەربازی دەوێت، با پرۆسەکە بەو هاوینە بێت، زۆریش دوانەکەوێت، پاشان دەرکەوت دواکەوتنی پرۆسەکە دەرخستەی نێگەتیڤی هەبووە.

بە بۆچوونی سیلسینین لە کۆتایی وەرزی پایزدا عەبدولناسر زۆر لە شوێنەوارەکانی دەشارێتەوە. لیژنەی لاوەکی ئەنجومەنی وەزیران بۆ چارەسەرکردنی کێشەی کەناڵی ئەلسویس لە رۆژی ٣٠ ی ئۆکتۆبەر مەبەستی سەرەکی پێشهاتەکە بەوە روونەکاتەوە کەوا ئەوان

مەبەستیان رووخانی سەرۆکی حکومەتی میسرییە، بۆیەش مەسەلەی گۆڕینی حکومەتەکەی میسر لە سەرەتاوە قسەی لەسەر کرابوو، سیلسینین وای دەزانی کەوا ئایدن لەو پرۆسەیەدا کارکەر نەبووە لەگەڵ ئەمریکییەکان، نەیدەزانی ئەو مەسەلەیە باندۆری چەند لەسەر پرۆسەی هەڵبژاردنی سەرۆکایەتی ئەمریکی دەبێت، کە بڕیاربوو لە مانگی نۆڤەمبەردا بکرێت، دیارە هەموو هەنگاوێکی بریتانی سەبارەت بە میسر بۆ ئەمریکییەکان جێگای بایەخ و مەبەست بووە.

## پەلاماردانی شارەکان

بەشدارکردنی هێزەکانی بریتانی دامەزراو لە لیبیا بۆ ئەو هێرشە، لە لایەن ئایدنەوە جێگەی باس نەبوو، لە ترسی عەرەبەکان نەوەك کاردانەوەیەکیان هەبێت، بۆی نەدەکرا ئەو هێزانە بجوڵێنێت. ئایدن بۆ باسکردنی ئەو پێشهاتە لە رۆژی ٦ ی ئۆگستی بەنهێنی سەردانی تشرشلی کردبوو، بەیەکەوە قسەیان کردبوو، ئەویش لە راسپاردەیەك هەر لە ناو ئوتومبێلەوە بۆی پڕ دەکاتەوە، لەوە ئاگاداری دەکاتەوە، کەوا ئەو لەو رووداوەدا تەنها مەبەستی ئەوەیە کەناڵەکە بگرێت، دەست لە فەرمانڕەوایی جەمال عەبدولناسر لە قاهیرەو لە ناوەند نەوەشێنێت، چونکە پەلاماردانی قاهیرەو دەسەلاتەکەی جەمال لە شارەکاندا پێویستی بە کەتیبەیە مودەرعە بریتانییەکەی ناو لیبیا دەبێت، دیارە ئەگەر بخوازن سەرۆکی میسری

لاببەن، دەبێ هێرشەکە بەرەو قاهیرەش ببەن، بەڵام ئەنجومەنی وەزیران وایاندەزانی بە هەبوونی سێ کەتیبەی بریتانی لە دەڤەری کەناڵەکە، دەسەڵاتەکە لە ناوەندییش لاواز دەکات، ئەوەش وا دەکات جەمال عەبدولناسر لە بڕیاری خۆماڵیکردنەکەی کەناڵەکە پەشیمان ببێتەوە.

پلانەکەش وا بوو، ئەوان یەکە سەربازییە میسرییەکانی کەنار کەناڵەکە بۆردومان بکەن، بە مەرجێك بۆردومانەکە نەگاتە سەر قاهیرە، مەبەستە سیاسییەکەش رووخاندنی دەسەڵاتی جەمال بوو، ئەوەش دروشمە نیشتیمانییەکانی جەمالیشی بەتاڵ کردبوو، کە مەبەستی بوو وڵاتەکە لە قاهیرەوە بەڕێوە بەرێتو دەسەڵاتەکەی هەر بمێنێت، لەویشەوە هێرش دەکاتەوە سەر هێزە داگیرکەرەکان، پلانەکەش لە بنچینەدا لاوازیو لاریشی پێوە دیاربوو. لە رۆژی ٧ ی ئۆگستییدا وەزیری دارایی (هارولد ماکملان) راپۆرتێکی کورتکراوە دەداتە (لیژنەی میسر) کە بریتی بوو لە رامانی تایبەتی خۆی لەسەر پەلاماردانەکەی کەناڵەکە، بۆچوونەکەی ئەویش رێك لە بۆچوونەکەی تشرشلەوە نزیك بوو، کە رۆژی پێش هێرشەکە بە ئایدنی سەرۆك وەزیرانی راگەیاندبوو، بەڵام ئایدن بە ماکملانی وتبوو تۆ ماڤی ئەوەت نییە قسە لەو بابەتانە بکەیتو لێدوانت هەبێت، من وەك سەرۆك وەزیران دەبێ تۆ لەو جۆرە بۆچوونانەدا پرسم پێ بکەیت، ئەوەش هێمای ئەوە بوو کەوا ئەو دوو پیاوە ئاڵۆزییەکیان لەنێواندا هەبووە.

## هه‌ڵوێستی ئه‌مریكییه‌كان

له‌ رۆژی ١٧ ی ئۆگستیدا ئایدن نامه‌یه‌ك بۆ تشرشل (٣٠ ی نۆڤمبه‌ر ١٨٧٤ _ ٢٤ ی یه‌نایه‌ری ١٩٦٥) ده‌نووسێت، كه‌ تێدا داواكاره:

دیاره‌ ئه‌مریكییه‌كان زۆر به‌توندی له‌گه‌ڵ هه‌ڵوێسته‌كه‌ی ئێمه‌ن بۆ ته‌دویلی كێشه‌كه‌ی كه‌ناڵی ئه‌لسویس. ئایزنهاوه‌ر له‌سه‌ر بڕیاره‌كه‌ی ئایدن زۆر ناكۆك بوو، له‌گه‌ڵ ئه‌وه‌دا نه‌بوو هێز له‌و كێشه‌یه‌دا به‌كاربێت، دیاره‌ ئه‌وده‌مانه‌ به‌رژه‌وه‌ندییه‌كانی نێوان بریتانیاو ولایه‌ته‌ یه‌كگرتووه‌كانی ئه‌مریكا له‌و قه‌یرانه‌دا دژی یه‌كتری بوون، دیاره‌ كه‌وا بریتانیا مه‌به‌ستی ته‌نها كۆنترۆڵی كه‌ناڵه‌كه‌ نه‌بوو، ئه‌وان ده‌یانزانی ره‌وشه‌ تایبه‌تییه‌كه‌ی كه‌ناڵه‌كه‌ بۆ ئه‌وان زۆر گرنگ و ستراتیژی بوو، حكومه‌تیش نه‌یده‌توانی هێڵێك راكێشێت له‌ نێوان قه‌یرانی كه‌ناڵه‌كه‌و رژێمی جه‌مال عه‌بدولناسر. له‌ ساڵی ١٩٥٧ سكرتێره‌ تایبه‌تیه‌كه‌ی ئایدن، رۆمانێكی زۆر مێژوویی گرنگ و هه‌ستیاری له‌سه‌ر ئه‌و سه‌رده‌مه‌ نووسیبوو، كه‌ له‌وده‌مانه‌دا ئه‌و له‌ وه‌زاره‌تی ده‌ره‌وه‌ كاری كردووه‌، تێیدا گه‌یشتبووه‌ ئه‌نجامێك كه‌وا زۆر هه‌ڵه‌یه‌ بریتانیا بتوانێت هه‌ردوو كێشه‌كه‌ له‌ یه‌ك كاتدا چاره‌سه‌ر بكات، ئه‌و ره‌خنه‌یه‌ش له‌ ئه‌مریكییه‌كانه‌وه‌ له‌و قه‌یرانه‌دا به‌ توندی ئاراسته‌ی بریتانییه‌كان كراوه‌.

بریتانییه‌كان مه‌به‌ستیان بوو بگه‌نه‌ ره‌وشێك كه‌شتییه‌كانیان له‌و كه‌ناڵه‌دا بپارێزن، جۆن فۆستر والس بۆ یه‌كێتی به‌كارهێنه‌رانی كه‌ناڵی ئه‌لسویس پێشنیاری كردبوو، كه‌وا باشتره‌ له‌ میسر حكومه‌تێكی تری جیاواز بێته‌ سه‌ركار، وه‌ك چۆن بریتانیا له‌ ساڵی ٢٠٠٣ له‌گه‌ڵ

داگیرکردنەکەی عێراقدا بوو، ئەو دەمانە بەئاشکرا باسی گۆڕینی ڕژێمی میسری نەکردووە، بەلام هەر ئەوەندەی بۆ دەچووە سەر کە بلێت دەریاوانی ناوچەکە لە مەترسیدایە، وەك چۆن پاش ٤٦ ساڵ لە عێراق ئەمریکاو بریتانیا چەکە کۆمەلکوژییەکەی عێراقیان کردبووە بیانوو بۆ داگیرکردنی ئەو ولاتە.

## حەبی ئارامکردنەوە لە ڕووبەڕووبونەوەی قەیرانەکەدا

لەو سێ مانگەی تێدا قەیرانەکە گەرم بوو، زۆر شت لە سەر تەندروستی ئایدن نووسرا، قسەی زۆریش کرا، هەندێکیان گلەیی بوون، یان مەزندەو خەیاڵ بوون، بەلام ڕووداوی ڕاستیشیان تێدا هەبووە. لەو ڕۆژانەو لە گەرمەی قەیرانەکەدا ئایدن دە جار سێر (هۆراس ئیفلتر)و چەند دکتۆری تری بینیبوو ڕێنمایی لێ وەرگرتوون، لە کۆتایی هەفتەداو لە ڕۆژانی ٥ تا ٨ ی مانگی ئوکتۆبەر سەردانی نەخۆشخانەی کردووە، لەوێ پێیان وتووە پێویستە نەشتەرگەرییەك بکەیتو دەرمانی (بیپیدین) یان بۆ نووسیبوو، دەرمانێکە لە مۆرفین وەرگیراوەو ژانی گران کەم دەکاتەوە، ئەگەرچی ئەو دەرمانەشی وەرگرتووە سەرۆکایەتی کۆبوونەوەی ئەنجومەنی وەزیرانی کردووەو ڕۆژێك تا شەوەکەش سەرقاڵ بووە. لە ساڵی ٢٠٠٤ ڕۆژنامەنووسی ناسراو (لۆرد دیدس) کە لە حکومەتەکەی ئایدن پۆستێکی وەزاریشی هەبووە، وتوویەتی ئایدن لە کاتی قەیرانەکەی ئەلسویس دەرمانی وەرگرتووە، وەك هەموو کەسێك دەرمان دەخۆن بۆ ئارامیو نووستنی

بەرەحەت، لە مانگی نۆڤمبەردا دکتۆرەکان لە تەندروستی ئایدن نیگەران بوون، داوایان لێ کردبوو بۆ پشوودانێك بچێتە جامایکا، دەرمانەکانی خەوزڕان کاریان لەو کردبوو، ئەو دەرمانی لەبەر نیگەرانیو نائارامیو بڕوابوونی زۆر بە خۆی وەردەگرت. لە وتاری رۆژی ١٥ ی یەنایەری ساڵی ١٩٥٧دا سیر (هۆراس ئیفانز) هەستی کردبوو ئایدن ژانە تایەکان بێزاریان کردووە. ئەو کە رۆژی هەینی رێکەوتی ٥ ی ئوکتۆبەر لە سەردانەکەیدا بۆ لای ژنە نەخۆشەکەی تووشی هاتبوو، بۆیە دکتۆرەکان ئامۆژگارییان کردبوو ئەویش ژوورێك لە تەنیشت ژووری ژنەکەی وەرگرێت، ئایدن لە کارەکانیدا بەردەوام دەبێتو ئەرکە رەسمییەکانی رادەپەڕێنێت، ئەو لەو رەوشەدا دەبێتو خەڵکەکەش هەتا برادەرەکانیشی ئاگاداری هیچ نەبوون، نەیاندەزانی چ روودەدات.

## پلانگێڕان و سەرکزکردن

ئایدن ماوەیەك پێش قەیرانەکەی کەناڵی ئەلسویس تووشی ئەو تایە هاتبوو، دوو رۆژ پێشتر ئایدن بە ئەنجومەنی وەزیرانی راگەیاندبوو کەوا لە یەکێتی سۆڤیەتەوە بە بەستنی هاوپەیمانییەك لەگەڵ میسردا مەترسییەك روومان تێ دەکات، ئەگەر ئەوەیان جێبەجێ کرا ئەوە مەترسییەکە دەبێتە واقیعو ناچار دەبین هێز بەکاربهێنین. لەودەمانەشدا هێزە بریتانییەکان لە دوورگەی قوبرسدا جووڵەیان تێکەوتبوو، ژمارەیان زۆر دەکرا، نەك تەنها لە قوبرسو لە

شوێنی تریش هەست بەوە دەکرا. ڕەوشەکە ئاماژەیان بەوە دەکرد کەوا ئامادە سەربازییەکە ئەگەر وا هەنگاوی هاویشتبووایە نەدەکرا ڕاگیرێن، بۆیەش میسرییەکان لە ڕۆژی ٥ی مانگی ئۆکتۆبەر لە ئەنجومەنی ئاسایش شکایەتیان لە سازکردنی سوپای بریتانیو فەرەنسی کردبوو. لە ڕۆژی ٨ی ئۆکتۆبەردا ئایدن لە نەخۆشخانە دەردەچێت.

کە سەرۆك وەزیران ئامادە نەدەبوو، ڕاب بتلر لە جیاتی ئایدن سەرۆکایەتی لیژنەی میسری کردبوو، ڕۆژی شەممە تەندروستی باش دەبێتو دەتوانێت لە کۆنگرەی حیزبی پارێزگاران لە ویلزدا وتارێك پێشکەش بکات، لەوێ هەوادارانی ئەو حیزبە، قسەکەی ئەویان زۆر لا باش بوو کە وتبووی:

ئێمە بەردەوام وتوومانە بژاری هێز لە هەموو ڕووداوو قەیرانەکان دوا چارەیە، بەڵام ئەو هێزە لە کاتی پێویست لە هەموو زروفێکدا بە دوور نازانین، هیچ حکومەتیش بەرپرس نییە ئەو بەڵێنە بدات.

لەو ڕۆژەی ئەو وتارەکەی پێشکەش کردبوو، (ئەنتۆنی ناتینگ) پێیوتبوو کەوا سەرۆك وەزیرانی فەرەنسی (گی مولییە) داوای کردبوو بە خێرایی ئایدن ڕەزامەندی خۆی لەسەر بینینی وەفدێکی فەرەنسی ڕابگەیەنێت کە لە پاریسەوە دەگەنە لەندەن، لە ئێوارەی ڕۆژی ١٣ی مانگی ئوکتۆبەر ناتینگ بە تەلەفۆن بە ئایدن دەڵێت کەوا سیر (گۆلدوین جیب) سەفیری بریتانی لە پاریس دەگاتەوە لەندەن، لەو سەفەرەدا جیب بە ئایدن دەڵێت:

کەوا فەرەنسییەکان (٧٥) فڕۆکەی جەنگی جۆری میستیر کە دوا

مۆدیلە داوەتە ئیسرائیلییەکان، ئەوەش بەبێ پرس و دانوستانی بریتانییەکان و ئەمریکییەکان کراوە، ئەوەش دەبوایە بە ڕێکەوتنی هەر سێ لایەن بکرابایە.! لەوەدەمانە ئایدن لە ناتینگ دەپرسێت:

ئایا ئیسرائیلییەکان لەوەدەمانەدا مەبەستیان لێدانی وڵاتی ئوردنە، ئەگەر وابێت ئەوەیان لەو هەلومەرجانەدا بریتانییەکان نیگەران دەکات.

ئایدن لە ڕۆژی یەکشەممەو لە ڕێکەوتی ١٤ی ئوکتۆبەردا نانی نیوەڕۆی لەگەڵ ناتینگ دەخوات، نامەیەکیش بۆ (سلوین لوید) لە نیویۆرک دەنێرێت، دیارە ئەو لە دانوستانەکەی لەگەڵ دکتۆر (موحەمەد فەوزی) وەزیری دەرەوەی میسری پێشکەوتنی بەدەست هێناوە، بەڵام ئێوارەکەی کۆبوونەوەیەك لە گەڵ نوێنەرە فەرەنسییەکان دەکات، ئەوانیش ژەنەراڵ (موریس شالیە)ی جێگری سەرۆکی هەیئەتی ئەرکانی چەکە ئاسمانییەکانی فەرەنساو (ئەلبێر گازییە) ڕێکخەری کاروباری وەزیری دەرەوەی فەرەنسی بوو، لەو کۆبوونەوەیەدا نیشانەی ترسناك سەرهەڵدەدات، هەر لەو کۆبوونەوەیەدا ئەنتۆنی ناتینگیش ئامادەبوو. بەرنامەکەی شالییەش پلانێکی فەرەنسی ئیسرائیلی دەگەیاند، کە دەبێتە ئامێریکی سیاسی ناوەندی لە مامەڵەکردن لەگەڵ ئایدن لە قەیرانەکەی ئەلسویس.

## سەرکزەکان

تا ئەو دەمەی ئایدن دەچێتە کۆبوونەوەکە نەیدەزانیو ئاگاداریش نەبوو کەوا فەرەنسییەکان وا بە قوولی وا لە پشتەوە پەیمانیان لەگەڵ ئیسرائیلییەکان بەستووەو کار بۆ دژایەتی میسر دەکەن. لە رۆژی ۳۰ ی مانگی سپتەمبەردا وەفدێکی ئیسرائیلی دەگاتە فەرەنساو بەنهێنی بیرۆکەیەکی بیانوودارو وەهمییان پێ دەڵێت، بەرنامەکەش بریتی دەبێت لەوەی ئیسرائیلییەکان پەلاماری کەناڵەکە بدەن، لەودەمانەدا هێزە فەرەنسییەکانو بریتانییەکان بۆ راگرتنی شەڕەکە دێنە پێشەوەو نابژیوانیان دەکەن، بە بیانووی ئاگربەستو راگرتنی شەڕەکە، هێزی ئاسمانی بریتانی لە فڕۆکەکانی میسری بدات، کە بوونەتە مەترسی لەسەر خاکی ئیسرائیل.

ئایدن پلانەکەی بە رەسمی قبووڵ نەکردبوو، بەڵام بەئاشکراش رەفزی نەکردۆتەوە، ئەوەش مانای ئەوەیە بڕیارەو جێبەجێ دەبێت، کە پرسیاریشی لە فەرەنسییەکان کردووە، مەبەستی ویستنی بەرنامەکەیەو رازیبوون دەگەیەنێت. شالیە هەستی کردبوو کەوا ئایدن بۆ مەسەلەکە گەرمە، بەڵام میلار ئەوەی بە ورووژاندن زانیبوو، ئەو شەڕەی بە فێڵکردن دەستی پێکردبوو، بە کارەسات کۆتایی هات، کەواتە ئایدن لەو شەڕەش بەرپرس بووە، چونکە دەسەڵاتی نەبوو بڕیارێك دەربکات. لەو رۆژەوە ئایدن بڕیار دەدات بەرنامەکە جێبەجێ بکاتو ئاگاداری ئەمریکییەکان نەکاتەوەو بەرنامەکەیان پێ نەڵێت، وای دەزانی بەرنامەو پلانی ئیسرائیلییەکان دوور لە زانینی ئەمریکییەکان دەهێڵێتەوەو ئەوان ئاگادار نابن، ئەوەشیان لە هەموو روویەکەوە

هەڵەو چەواشەبوو.

ئەگەر ئایدن ئەودەمانە تەندروستی باش بووایەو کەسێکی چالاك بووایە هەرگیز ئەو بەرنامەی قبووڵ نەدەکردو تۆوی مالۆێرانی نەدەچاند. فەرەنسییەکان پەیوەندی پتەویان لەگەڵ ئیسرائیلییەکان لەسەر رێکەوتنامەی بنکەی کەناڵی ئەلسویس هەبوو. ئیسرائیلییەکان گومان و ترسیان لەوەدا هەبوو کەوا سوپای بریتانی لە میسر بکشێتەوە، فەرەنسییەکانیش لەوە ترسیان هەبوو، رەنگە میسرییەکان لە جەزائیر بەشدارو هاوکاری بەرگری و رووبەڕووبونەوەکانی بکەن. سوپای فەرەنسی لە جەزائیر ژمارەیان دەگەیشتە ٤٠٠ هەزار سەرباز، جەمال عەبدولناسریش بەئاشکرا پشتگیری شۆڕشی جەزائیری دەکرد، بۆیەش فەرەنسییەکان سوور بوون لەسەر ئەوەی ئەو سەرۆکە میسرییە لەناوبەرن. لەولاشەوە فرۆشتنی چەکە فەرەنسییەکان بۆ ئیسرائیل تەرازووی رێکەوتنە سێ قۆڵییەکەی فەرەنساو بریتانیاو ولایەتە یەککگرتووەکانی گۆڕی بوو. سەرۆك وەزیران بەتایبەتی کەسێکی وەك ئایدن کە سیاسەتمەدارێکی زانابوو، ماوەیەك وەزیری دەرەوەش بووە، بۆیە پێشنیارەکەی شالییە بۆ سەرکزکردن و پلانە دوو قۆڵیەکەیان لەگەڵ ئیسرائیل مەسەلەیەکی مەترسیدارو بقە دەبینرا.

ئایدن خۆی کەسێکی وریابوو، زۆریش بەوە دەناسرا کەوا دۆستی عەرەبە، لەبەر تۆمارە ناسراوەکەی ئەوو ناوبانگییەکەی دەزانرا ئەو لە هەموو رێکەوتنەکاندا ئیسرائیلی پەراوێز دەکردو رازی نەدەبوو لەو مەسەلەیەدا بەشدارییان پێ بکات. وەکیلی وەزیری دەرەوە سێر (ئایڤۆن کیرکباتریك) ئەو دبلۆماسە ناودارە تاکە کەس بوو دەیویست

ئەو قەیرانە بە هێز چارەسەر بکات، ئەو وای دەزانی ئەمریکییەکان حەز ناکەن ئاگادار بن کەوا بریتانییەکان بەرنامەی تایبەتیان هەیە بۆ بەکارهێنانی هێز لەو قەیرانەدا. ئایدن ئامادەبوو بریتانیا لەگەڵ ئەمریکا پێشنیاری یەکێتی بەکارهێنەرانی کەناڵی ئەلسویس قبوول بکات، کە کەناڵەکە بدرێتە ژێر چاودێری دەولی، ئەوەش رەنگە بایکۆتی ئابووری لێ بکەوێتەوە، رەنگە پاشان (جۆن فۆستر دالاس) لە کۆتاییدا بڕیاری بزاری سەربازیو هێز بدەن، ئەو کارەش دیارە کەوا تا مانگی ئوکتۆبەر کاتی دەوێت. ئایدن ئامادەبوو بە خۆی پێشنیارەکەی شالییەیان پێ رابگەیێنێت. ئایدن داوا لە لە ناتینگ دەکات ئاگاداری دوو کەسی بەرپرس لە وەزارەتی دەرەوە بکات، گومان دەکرا یەکێك لە راوێژکارانی یاسایی لە وەزارەتی دەرەوە پێشنیارەکەی ئایدن لەبەر رۆشنایی یاسای نێودەوڵەتی رەفز بکات، بۆیە زوو ئەو لەو پۆستە لا دەبەن. ئایدن لەو بڕارەدا پشتی بە پێشنیارەکەی سەرۆکی قەزاکە ئەستوور بوو کە پاڵشتی ئەگەری سەربازی دەکرد، بەلام لە رووی دەستوورییەوە سەرۆکی قەزاکە نابێتە راوێژی یاسایی ئەنجومەنی وەزیران، ئەوەش کاری نائیبی گشتییە. کە بەرنامەکە هاتۆتە بواری جێبەجێکردن ناتینگ ئیستقالەی دابوو.

## پەلاماردانەکە

لـە ۲۹ ی ئوکتۆبـەردا هێـزە پەڕەشـووتوانەکانی ئیسـرائیل بـە سەرپەرشتی سەرکردەی سەرکەشی ئیسرائیلی (ئاریل شارون) دابەزینی سـەربازی لـە سـینا دەکـات، بـۆ بەیانییەکـەی‌و بـە ڕێکـەوتن لەگـەڵ ئیسرائیلییەکان، بریتانییـەکان‌و فەرەنسییەکان ئاگادارکردنەوەیـەکیان بۆ ئاگربەس ڕاگەیاند، ئەگەرنا ڕاستەوخۆ بۆ ڕاگـرتنی شـەڕەکە کارێـك کەن. جەمال عەبدولناسر گوێ بـە ئاگادارکردنـەوە نـادات، بۆیـەش لـە ڕۆژی ۳۱ ی ئوکتۆبـەر هێزەکـانی سـەربازی ئـەنگلۆ فەرەنسی پـەلاماری ناوچـەکەیان داوە. سـەرەڕای فشـارو تەنگاوەییـەکان لەودەمانـە ئایـدن ئـارام‌و هێمنانـە دەجوڵێتـەوە، هـەر بـەو نەفسـەوە بروسـکەیەك بـۆ سـەرۆك ئایزنهـاور دەنێرێـت، کـە لـە ڕۆژی ۳۱ ی ئوکتۆبـەر فڕۆکـە بریتانییـەکان زەبریـان لـە هێزەکـانی میسـری دەوەشـاند، ئیلزابێسـی هاوسەری لۆرد هیوم وتبووی:

زۆر بـە کارنامـە باشـەکەی سـەرۆك وەزیـران‌و هـەموو ئەنـدامانی حکومەتەکە سەرسام بووم.

بـــۆ دڵنیاکردنـــەوەی هاوڵاتیـــانی بریتـــانی ئایـــدن بـــەیانێك بڵاودەکاتـەوە، بـەڵام کـە لـە ئێـوارەی ڕۆژی ۳ ی نۆڤمبـەردا نوێنـەری دەستەی ئیستگەی بریتـانی بـانگ دەکرێـت‌و لـە بارەگـای سـەرۆکایەتی وەزیـران دەچێتە ژوورەوە، دەبینێـت کـەوا ئایـدن لەسـەر سیسـەمەکەی پاڵی داوەتەوەو لە تەنیشت خۆیەوە چەند شووشـەی دەرمـان دەبینـرا. لەودەمانــەدا مانـدووبوونی پێـوە دیـاربوو، بۆیـەش ئـەو داوا دەکـات سەرۆك وەزیران پێش خوێندنـەوەی بەیانەکـە پشوویەك بـدات، بـەو

رستەیە ئایدن قسەی کردبوو:

ئەو پیاوەی پیاوی ئاشتی بووەو پیاوی هەیئەتی دەوڵەت بووەو پیاوی نەتەوە یەکگرتووەکانیش بوو، ئێستاش ئەو پیاوە هەر وایە.!

## چاکە دانەوە

هارولد ماکمیلانی وەزیری دارایی زۆرپابەند بوو بە سیاسەتەکانی ئایدنەوە، پێش ئەوەی لە کۆشکی سپی دیمانەی ئایزنهاور بەتەنها لە رۆژی ٢٥ ی سپتەمبەردا بکات، ئامۆژگاری ئایدن دەکاتو دەڵێت:

ئایزنهاور سوورە لەسەرئەوەی بە هەر شێوەیەك بێت جەمال عەبدولناسر (١٥ ی یەنایەری ١٩١٨ _ ٢٨ ی سپتەمبەر ١٩٧٠) بڕوخێنێت، من شرۆڤەی رەوشی ئابووریو گرفتەکانم بۆ کرد، باسی دەستدرێژی خۆمانیشم بۆ کردو ئەویش لە بۆچوونەکان باش تێگەیشت.

کە ماکمیلان لەو سەفەرەدا وەزیری دەرەوەی ئەمریکی (جۆن فۆستر دالس) دەبینێت، راپۆرتێك بۆ ئایدن دەنووسێت، کەوا دالس وتوویەتی سەرەڕای ئەوەی کێشەی کەناڵی ئەلسویس هیچ باندۆرێکی لە سەر ئەو هەڵبژاردنە نییە کە لەو رۆژانەدا دەکرێت، بەڵام ئەگەر لە سەر هەر شتێك ئیمزایەك بکات، کارەساتێك روودەدات، ئەوەشی بەبیر هێنامەوە کەوا چۆن ئەوو سەرۆك ئایزنهاور لە مانگی مایۆی ساڵی ١٩٥٥ لە کاتی هەڵبژاردنەکانا یارمەتی ئێمەیان داوە، بۆیەش ئەو داواکارە چاکەکەی بدەنەوەو کۆشش بکەن رووداوەکان بگێڕنەوە

پێش رۆژی ٦ ی نۆڤمبەر. ئەو لێدوانەی وەزیری دەرەوە دالس ئاماژەی ئەوە بوو کەوا ئەو هەنگاوە بۆ دوای هەڵبژاردنەکانی ئەمریکی دوابخرێت، ئایدن بە ئوسلوبێکی روون و ناسك لە نامەکانیدا لەگەڵ ئایزنهاور باسی ناسکی ئەو هەڵبژاردنەی کردبوو، پاش تێپەربوونی مانگی ئوکتۆبەریش ئایدن و ماکمیلان نەیانتوانی ئایزنهاور تێبگەیەنن لە هەڵبژاردنی سەرۆکایەتی پرۆسەی پەلاماردانەکەی سەر وڵاتی میسر چەند کاریگەری لەسەر ئەودا هەیە. ئەوەش جێگای گێلییە ئەگەر ئەوە رەچاو نەکەن.!

## لێکدانەوەیەکی هەڵە

ماکمیلان وەك وەزیری دارایی کە نامەکانی لە واشنتۆنەوە لە شەوی ٥_٦ ی نۆڤمبەر دەگەیشتە دەست، ئەو یەکەم کەس بوو دەیزانی لێکدانەوەکانی سەبارەت بە کاردانەوەکانی ئایزنهاور کەوا جنیەی ئەسترلینی کاردانەوەیەکی گەورەی لەسەر پاشکەوتی پارەی بێگانە هەیە، ماکمیلان پێویستی بەوە هەیە قەرزی یەدەگ لە سەندوقی نەقدی دەولی وەرگرن، ئەوەش پێویستی بە یارمەتی ولایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا هەیە، دیارە یارمەتی و پشتیوانی ئەمریکا بۆ جینیەی بریتانی لەگەڵ شەڕ راگرتنەکە گرێدرابوو، کە دەبوایە لە ناوەڕاستی ئەو شەوە ئەوە رابگەیەنن. کە کاروانی کەشتیەکانی شەشەمی ئەمریکی لە سەر کەنارەکانی پۆرسەعید، دەریاوانی بریتانیان تەنگاو کردبوو، ئەوەش پەیامێك بوو بۆ ماکمیلان

بۆ گۆڕینی بۆچوونەکەی بۆ پشتیوانی سەربازی راستەوخۆو خێرا. دەسەلاتی ئایدن هەرگیز هەژانو گورزی وەك گورزەکەی رۆژی ٦ ی نۆڤمبەر بەرنەکەوتبوو، تاکە کەسیش لەو حکومەتە وەزیری دارایی ماکمیلان بوو، کە دەیتوانی ئەنجومەنی وەزیران لەسەر ئایدن هەلسێنێتەوە بۆ دەست لەکارکێشانەوە، کە ئەوانیش ئامادەیی ئەوەیان هەبوو. بەلام لەو دەمانە ئایدن زووتر دەجولێتەوەو داوا دەکات ئەنجومەنی وەزیران لە ژوورەکەی ئەو لە ئەنجومەنی عەموم لە سەعات دەو چارەکێك کەمی بەیانی کۆببنەوە، ئەویش دلنیانەبوو کەوا دەتوانێت زۆرینەی دەنگەکان بۆ بەردەوامی ئەنجومەنەکە وەرگرێت بۆ بەردەوامی سیاسەتەکانی خۆی. ئەو دلنیابوو کەوا ئەمریکییەکان هەر ئەو رۆژە بە بڕیارێکی ئەنجومەنی ئاسایش بایکۆتی ئابووریمان ناخەنە سەر، بۆیە وا باشە بە زووترین کات ئێمە ئاگربەستەکە راگەیەنین، بە قسەی یەکێك لە ئەندامانی ئەنجوومەنەکە، ماکمیلان زۆر سووربوو لە سەر ئاگادارکردنەوەکەی کە ئەمریکییەکان بەنیازن بیکەن، بۆیە ئەو وەك وەزیری دارایی بە ئەنجوومەنی راگەیاندبوو کەوا رەوشی داراییان زۆر ترسناکە.

## قەیرانێکی دبلۆماسی

قەیرانێکی دبلۆماسی گەورەبوو، بۆیە ئایزنهاور وتبووی:

مـن شـتی وام نـەدیوە، کـە هێزێکـی زلهێـز ئاژاوەیـەکی لـەو جـۆرە دروسـت بکـات، رەوشـەکە بشـێوێنێت. کـە فشـارەکانی ئـەمریکا تونـد دەبێتو دۆستەکانیان دەکشێنەوەو ئەمریکییـەکان فشارەکەیان لەسـەر جنیـەی ئەسـترلینی تونـد دەکـەنو هەرەشـەکەی (نیکـۆلا بولگـانین) سەبارەت بـە کێشـەکەی ئەلسویس فەرەنسـییەکانو بریتانییـەکان زۆر سارد دەبنەوەو پاشەکشە دەکەن، لە بەیانی رۆژی ٤ ی فبرایـر بولگـانین ٢٠٠ هـەزار سـەربازی سـۆڤیەتیو ٤ هـەزار دەبابـە بـەرەو بودابسـت بەرێدەکات، لەولاشەوە لە ئەنجوومەنی ئاسایش هـیچ هاوسـۆزییەك بـۆ پەلاماردانەکەیان پەیدا ناکەن.

ئایدن بـە دیـدی خـۆی وای بـە بـاش دەزانـی تـا هـەموو کەناڵەکـە دەگرن، بۆ پاراستنی ناوی بریتانییەکانو فەرەنسییەکان داوای بەستنی کۆبوونەوەکەی ئەنجوومـەنی ئاسـایش تـا پـاش رۆژی ٧ ی نۆڤمبـەر دوا بخەن، بەوەش کات دەکوژنو هەموو کەناڵەکـەش تـەواو دەگـرن، ئـەوان واتـە بریتانییـەکانو فەرەنسییەکان مـافی ڤیتۆیـان بـۆ هـەر بڕیارێـك دەردەکـرد کـە لـە ئەنجومـەنی ئاسـایش لەسـەریان دەربچێت، ئـەوەش بۆچوونی سەرۆك وەزیرانی فەرەنسی (گی مولیە)و سـەرۆك وەزیرانـی ئیسـرائیلی (دیڤیـد بـن گوریـون) یـش بـوو، بـەلام ئایـدن نـەیدەتوانی زۆرتـر چاوەڕوان بکاتو لەڕوی ئەنجومەنی ئاسایش بووەستێتەوە.

## رووپۆش لەسەردانان

لەبەردەم ئەنجوومەنی عەمومدا، وا نیشاندەدرا کەوا ئەو پەلامارە سەربازییەی سەر میسر، هیچ دەستی ئیسرائیلی تێدا نەبووەو بۆ بەرژەوەندی ئەوان نەبووە، بۆ ئەوەش بیانوو هەبوو. ئەوەی جێگەی سەرسوڕمانو سەیرە کەوا ئایدن هەستیدەکرد ئەو دەتوانێ تا ماوەیەکی دووردرێژ پەردە لەسەر ئەو مەسەلەیە دانێتو بە شاراوەیی بمێنێتەوە، بۆیەش دوو دبلۆماسی رەوانەی پاریس کردبوو، تا لەوێ ئەو دیکۆمێنتانە کۆ بکەنەوە کە پاشان ناویان نابوو (پرۆتۆکۆلی سیڤەر)، کە بە ناوی ئەو دەڤەرەی پاریس ناونرابوو کە کۆبوونەوەکەی تێدا سازکرابوو، مەبەستیان لە کۆکردنەوەی دانەی راپۆرتەکەش بۆ فەوتاندنیان بوو. (سلویز لوید) لە یەکەم کۆبوونەوەی سیڤەر ئامادە دەبێت، بەڵام لە کۆبوونەوەی دووەمدا (پاتریك دین) ی دبلۆماسی ناودارو سکرتێری تایبەتی لوید (دۆناڵد لۆغان) بەشدار دەبێت. گی مولیەو دیڤید بن گوریۆنیش لە هەردوو کۆبوونەوەکەدا بەشداردەبن، لەوێ گفت دەدەن ناوەرۆکی کۆبوونەوەکە زۆر بەنهێنی بپارێزن.

ئایدن ئەوەی باش دەزانی کەوا لە وڵاتانی دیموکراسی هەتا هەتایە نهێنییەکان بە شاراوەیی نامێنێتەوە، سەرکردە فەرەنسییەکانو ئیسرائیلییەکان بە بڕیارەکەی ئەنجوومەنی وەزیرانی بریتانی بە راگرتنی پێشڕەوی هێزەکان لە ناوچەی کەناڵەکە تووڕە ببوون، ئەوانیش لە پەلامارەکە هەستیان بە شەرمەزاری نەدەکرد، بۆیە زۆریان مەبەست نەبوو، مەسەلە شاراوەکان بەنهێنی بهێڵنەوە. ئایدن

وای دەزانی پەردە دانان و شاردنەوەی ڕووداوەکان بۆ ماوەی چەند هەفتەیەك لە چاوو هەستی هەواڵگری ئەمریکی دوور دەمێنێتەوە، ئەگەر چەند سەعاتێکیش ئەوان ئاگادار نەبن، باشترە، ئەوەش بۆچوونێکی ناواقیعییە. بەڵام لە ڕاستیدا هەواڵگری ئەمریکی ڕایگەیاندبوو کەوا لە قۆناغە سەرەتاییەکانی پەلاماردانەکە ئاگاداربووە، بەڵام هەندێ هێمای گومانیش هەبوو، کە لە ڕۆژی ٢٤ ی نۆڤەمبەر فۆستەر دالس هەواڵی مەسەلەکەی زانیبوو، گومانی کردبوو کەوا فەرەنسییەکان بە هاوکاری ئیسرائیلییەکان ئەوەیان کردووە، هیچ بیری بۆ بریتانییەکان نەڕۆیشتبوو. کە فەرەنسییەکان و بریتانییەکان دوا ئاگادارکردنەوەکەیان ڕاگەیاندبوو دالس گومانی لە پلانە شاراوەکان کردبوو. (کریستیان بینو) لە ئایدن واقیعی تر بوو بۆ بەرنامە شاراوەو تەونە نهێنییەکەیان، بەڵام ئایدن خۆی نیشاندەدا کەوا لە ڕووی ئەمریکییەکان کەمتەرخەم نەبووەو هیچی نەشاردۆتەوە، بەوەش ئەمریکییەکان زۆرتر تووڕە دەکات.

## وەڵامدانەوەی هەڵخەڵەتاندنەکە

دیارە کەوا ئایدن ماوەی دە ساڵە ئایزنهاور دەناسێت، ئەگەر ئەو ناسیارە دێرینە لەبەرچاو بگرین، ناکرێ ئەوە قبووڵ بکەین کەوا ئەو وەڵامی هەڵخەڵەتاندن و چەواشەکارییەکان نەداتەوە، کە لەلایەن ناسیارێکیشەوە بێت، بەتایبەتی ئەگەر مەسەلەکەش گرنگ و پڕ بایەخ

بێت. بە قسەی سەفیری ئەمریکای ئەوکات لە بەریتانیا ئایزنهاور نەك دالسی وەزیری دەرەوە کەدەستێکی باڵای هەیە لە دیاریکردنی سیاسەتی دەرەوەی ئەمریکادا. ئایدن سووربوو لەسەر هەڵوێستەکەی، کە لە ئەنجوومەنی عمومدا لە ٢٠ ی دیسمبەردا وتبووی:

من لەوە ئاگادارمو زووتر زانیوومە کەوا ئیسرائیل هێرش ناکاتە سەر میسر. دیارە کەوا ئەو قسەیەش درۆ بووە. لە ماوەی سیو دوو ساڵدا کە ئایدن لە پەرلەمان بووە لە پێش ئەنجوومەنەکە درۆی نەکردبوو. ئەوەش لە رەوشتو کەسایەتی ئەو نەدەوەشایەوە، بۆیەش هەر زوو دەست لە پۆستەکەی دەکێشێتەوە، بۆیەش لە رۆژی یەکی یەنایەری ساڵی ١٩٥٧ (هۆراس ئایانز) داوا دەکات سەرۆك وەزیران دەست لەکار بکێشێتەوە، ئەگەرنا لە کۆتاییدا دەبێ خۆی بکوژێت. دکتۆرێك وتبووی کەوا ئایدن جەرگی زیانی بەرکەوتبوو، بەلام ئایدن لەبەر قەیرانی سیاسی ئیستقالەی داوە نەك لەبەر خراپی تەندروستی، پێش ئەوەی ئایدن دەست لەکار بکێشێتەوە زووتر ئاگاداری ونستۆن تشرشل دەکاتەوە. ئەو لە دوا ئەرکەکانیو پێش دەست لەکار کێشانەوەکەی وەك سەرۆك وەزیران، ئیستمارەیەك لەسەر دوا دیمانەی لە رۆژی ٩ ی یەنایەر لەگەڵ شاژن پڕدەکاتەوەو بۆ رۆژی دواتر ئیستقالەکە دەدات، ئەو بە شاژنی وتبوو:

کەوا راپۆرتی دکتۆرەکانم ئەوە نیشاندەدەن کە چاری تر نەماوە بێجگە لەوەی دەستبەرداری فەرمانەکان بم، نەك وەك سەرۆك وەزیرانی شاژن.

## كۆتايی

پەيوەندی نەخۆشييەكەی ئايدن بە هەڵەكانی لە رووداوەكەی ئەلسويس چ بوو؟

مێژوونووسو پەرلەمانتاری پێشوو لەسەر ليستی حيزبی پارێزگاران (رۆبرت رودس) وا دەزانێت ئەو ناتوانێت هۆكارەكانی ئيلتزامكردن بە هەڵوێستە شەرعييەكانو نزيكبوونەوە لەوەی كە ئەو كەسێكی شەرعييە دەستنيشان بكات. كەسانی واش هەيە كەوا گومان دەكەن نەخۆشيەكەی رۆڵێكی دياريشی هەبووە، دكتۆر (هيو تۆماس) كە يەكێك بووە لە دكتۆرە چارەسەركەرەكانیو سەرپەرشتی تەندروستی ئايدنی كردووە، ئەوو دكتۆر (تی هانت) وايان دەزانی، ئەگەر ئايدن تەندروستی نۆرماڵو ئاسايی بوايە، رەنگە لە رووداوەكەی ئەلسويسدا بە شێوەيەكی تر دەجولايەوە. كرۆكی مەسەلەكە لەو هەنگاوە سەربازييە تەنها ئەوەبوو كەوا بڕيارەكەيان لە سەر دەست لەناو دەستی ئيسرائيل بووەو بێ پرسی ويلايەتە يەكگرتووەكانی ئەمريكايش كراوە. بەڵام هێماكانيش نيشانی ئەوە دەدەن گوايە ئەگەر تەندروستی ئايدن باش بووايە، ئەو كارەو ئەو هەنگاوە سەربازييەی نەدەكرد، بەڵام ئايدن زۆرتر لە روانگەی پەيداكردنی پێگەی سۆڤيەتی بوو لە ناوچەكە، ئەوەشی بە هەڕەشە دەزانی لە ناوچەكە، بۆيەش رووداوەكانو بڕيارەكان هيچ پەيوەندی بە تەندروستييەوە نەبووە. ئەو هەستی دەكرد جەمال عەبدولناسری سەركێشو پشتيوانلێكراو لەلايەن سۆڤيەتەوە لە بەهاری ساڵی ١٩٥٧ بەرەو ئيسرائيل دەچێتو پەلاماری دەدات.

که کەناڵەکه خۆماڵی دەکرێت، نەخۆشییەکەی ئایدن یەکێك بوو لە هۆکارەکانی دارشتنی بەرنامەی سیاسەتەکەی ئایدن. (رۆبرت کار) لە ساڵانی حەفتاکان وەزیرێکی دیاری پارێزگارەکان بوو، لەودەمانەی پەرلەمانتاربووە دۆستایەتی لەگەڵ ئایدن خۆش بووە، زۆریش بەو سەرسام بووەو ماوەیەکیش پۆستی سکرتێری تایبەتی ئەو بووە، ئەو لەسەر مەسەلەی تەندروستیو باری هۆشیارییەکەی وتوویەتی:

من زۆرم لا سەیرە باس لەوە دەکرێت کەوا رەوشی تەندروستی ئەو کاریگەری لەسەر سیاسەتەکەی هەبووە، من بەو قسانە بڕوا ناکەم، چونکە ئەو پێش ئەوەی نەخۆش بکەوێت رەوشی باش بووە، هەمان بەرنامەو کارنامەی سیاسی هەبووە، من زۆریشم لەلا سەیرەو بڕواش ناکەم، ئەو لە بوارەکانی سیاسیو سەربازیدا هەڵە بکاتو حیساباتەکانی لە راپەڕاندنی کارەکانیدا تەواو نەبن.

دەبوایە بۆ بەرژەوەندی وڵاتەکە، دکتۆرەکان ئامۆژگاری بکەن، هەر هیچ نەبوایە، لەکاتی بەرزبوونەوەی تایەکانی بڕیاری دەرنەکردبایە.

ئەگەر لە شەوی ١٣ ی ئەکتۆبەر لەبەر خراپی رەوشی تەندروستی، بە کۆنگرەی حیزبی راگەیاندبوایە، کەوا من نەخۆشمو لەسەر رێنماییەکانی دکتۆرەکان دەست لەکار دەکێشمەوەو سەفەری جامایکا دەکەم، ئەوەی لە کەناڵی ئەلسویس کردی نەدەقەوما، مەسەلەکە لەو ناوچەیە بە شێوەیەکی تر دەکەوتەوەو مێژووی رووداوەکە بە شێوەیەکی تر دەنووسرایەوە. بەڵام دانوستانەکەی (سلوین لوید) لە نیویۆرك لەگەڵ وەزیری دەرەوەی میسری کە ئایدنو ئەنتونی ناتینگ

بەر لە کۆبوونەوەکەیان لەگەڵ شالیە بە گەشبینی دەزانیو چەند هەفتەیەکی زۆرتریشی دەویست، ئەگەرنا سەرۆك وەزیرانی راسپێردراو بە وەکالەت کارەکانی تەواو نەدەکرد، یان وەزیری دەرەوە لە رەوشێکدا دەبوو نەیدەتوانی سیاسەتێکی نوێ پەیرەو بکات وەك پێشنیارەکەی فەرەنسییەکانو ئیسرائیلییەکان، هەر هیچ نەبوایە تا کۆتایی هەڵبژاردنەکانی سەرۆکایەتی ئەمریکی لە رۆژی ٦ ی نۆڤمبەردا. ئەگەر کەناڵی ئەلسویس پەلاماری نەکرابایەتە سەر سەر، ئەوەو رەوشەکەی هەنگاریا بەو جۆرەش نەدەکەوتەوە، کە شۆڕشی هەنگارییەکان کە لە رۆژی ٢٣ ی ئۆکتۆبەر هەڵگیرسابوو، ئاگربەستی تێدا راگەیاندرابوو، هێزە سۆڤیەتییەکانیش بەناچاری لە مەیدانەکە پاشەکشەیان دەکرد. لە رۆژی ٢ ی مانگی نۆڤمبەردا (نیکیتا خروشۆف) بیمانەی سەرکردەی یۆگۆسلاڤی (برۆز تیتۆ) دەکات، لەوێ تیتۆ دان بەوەدا دەنێت کەوا پەلامارەکەی سۆڤیەت بۆ سەر هەنگاریا هۆکاری خۆی هەیە، دیارە کەوا خروشۆف وتوویەتی:

قەیرانەکەی ئەلسویس دەرفەتێکی گونجاو بوو، ئەو مەسەلەیە یارمەتی ئێمەی دا، ئەگەرنا لە خۆرئاواو نەتەوە یەکگرتووەکان دەبووە ئاژاوەو قەیرانێکی گەورە، ئەگەر بریتانییەکانو فەرەنسییەکانو ئیسرائیل ئەو هێرشەی کەناڵی ئەلسویسیان نەکردبوایە، ئەنجامەکە وا نەدەکەوتەوە، ئەوان لەوێو ئێمەش لە یۆگۆسلاڤیا دەستو پلانمان هەبووە. پاش ماوەیەکی کورت لە نیوە شەوی یەکشەممەی ٤ ی نۆڤەمبەر دەبابەکانی سۆڤیەتی سەنگەرە بەرگرییەکانی چواردەورەی بودابستیان شکاندو لە رۆژی دوایی (بۆب بیرسون دیکسۆن)

بروسکەیەك بۆ وەزیری دەرەوە لە نەتەوە یەکگرتووەکان دەنێرێت، تێیدا نووسیبووی: کە روسەکان هێرشیان کردۆتە سەر بودابیست، ئێمە هیچمان پێ ناکرێت، ناتوانین گلەیی‌و نارەزایی بکەین، چونکە ئەوان بودابیستیان بۆردومان دەکرد، لەولاشەوە ئێمە قاهیرەمان بۆردومان دەکرد، بۆیە دەسەڵاتمان نییە. قەیرانەکەی ئەلسویس باندۆری زۆری لەسەر سیاسەتی دەرەوەی بریتانی‌و فەرەنسییەکان هەبوو، فەرەنسییەکان بە توندی بە رووی هەژموونی ئەمریکییەکان دەوەستانەوە. بریتانییەکانیش پاش شەرمەزاریی‌و شکانەکانیان‌و بۆ پتەوکردنەوەی پەیوەندییەکانیان بە ئەمریکییەکانەوە کەوتوونەتەوە کار، ئەوەش لە بروسکەی ماتەمینی ئایدن بوو لە رۆژنامەی تایمزی ساڵی ١٩٧٧ بڵاودەبێتەوە کە نووسیبوویان:

ئایدن دوا سەرۆك وەزیران بوو کە هەستی دەکرد، بریتانیا تاکە زلهێزە، بەڵام کە دەکەوێتە ناو قەیرانیش دەردەکەوێت وا نییە!

## سەرۆك جۆن کەنەدی و نەخۆشی ئەدیسۆن

لە مانگی نۆڤەمبەری ساڵی ١٩٦٠ جۆن کەنەدی (٢٩ ی مایۆ ١٩١٧ _ ٢٢ ی نۆڤمبەر ١٩٦٣) لە هەڵبژاردنی سەرۆکایەتی بە ٣٠٣ دەنگ بەرامبەر ٢١٩ دەنگ لەگەڵ ریتشارد نیکسۆن بە سەرۆکی ئەمریکی هەڵدەبژێردرێت، بەوەش ئەو دەبێتە گچکەترین سەرۆکی ئەمریکی کە تەمەنی ٤٣ ساڵ بوو، بۆیەش ناوەکەی نەك تەنها لەناو ئەمریکا لە هەموو جیهان بڵاودەبێتەوە. هەر ئەویش کە دەمرێت بە تەمەن گچکەترین سەرۆك بوو، ئەوەی ناخۆشیشە ئەو چوارەم سەرۆکیشە دەکوژرێت. کە ئەو دەبێتە سەرۆکی ئەمریکی سەرۆکی سۆڤیەتی (نیکیتا خروشۆف) تەمەنی ٦٦ ساڵ بوو، سەرۆك وەزیرانی بریتانی (هارولد ماکمیلان)و سەرۆکی فەرەنسیش (شارل دیگۆل) لە هەفتاکانی تەمەنیاندا بوون، سەرۆك وەزیرانی هیند (جواهیر لال نەهرۆ) ش تەمەنی ٧١ ساڵ بوو، سەرۆکی ئیسرائیل (دیڤید بن گوریون) ٧٤ ساڵی تەمەن بوو، (پاپا یوحنای سیازدە) ٧٩ ساڵ بوو، راوێژکاری ئەڵمانی (کۆنراد ئادینادەر) یش تەمەنی ٨٤ ساڵ دەبوو. هەموو ئەو سەرۆکانە تەندروستیان لە کەنەدی تەمەن ٤٣ ساڵە باشتربوو.

## نەخۆشی بە دزی

ئەمریکییەکان دەیانزانی کەوا سەرۆکەکەیان نەخۆشە، بەلام هەموو زانیارییەکەیان لە سەر رەوشی تەندروستیو جۆری نەخۆشییەکەیان نەبوو، ئەو نەخۆشی ئەدیسۆنی هەبوو، تا ئەو نەمرێتو ژیانی بەردەوام بێت، دەبوایە نەخۆشەکە هۆرمۆنەکەی بگۆڕن، لە کاتی هەڵمەتی هەڵبژاردنەکان جانتای دەرمانەکانی گوم دەکات، بۆیە کەنەدی بانگەوازی گشتی دەکات تا نهێنییەکەی نەدۆزرێتەوە، ئەوەش بوو گرەوەکەی بەرەو کۆشکی سپی دەدۆرێنێت. سەرۆك کەنەدی نەیدەویست جۆری ژیانی بگۆڕێت، بە هیچ شێوەیەك نەیویست دکتۆرێکی تایبەت بە خۆی دەستنیشان بکات، دەرمانەکانی بە رێکوپێکی بەکارنەدەهێنا، لە بەرامبەر ئەوەش هێزی سەرۆکایەتییەکەی خۆی بەکارهێناوە بۆ پاراستنی نهێنی نەخۆشییەکەی، خۆی وەك گەنجێکی سەلامەتو ورە بەرزو پیاوی خێزانێکی بەختیار نیشانداوە، بەلام ئەو دیمەنانە دوورن لە راستییەوە.

## هەڵەکانی ساڵی یەکەمی

لە سەرەتای حوکمی سەرۆك کەنەدی، من لە لەندەن خوێندکاری کولێژی پزیشکی بووم، منیش وەك بەشێکی زۆری گەنجانی جیهان هیوامان بە سەرۆك کەنەدی بەرز بوو، کەوا جیهان لە قەیرانی شەڕی ساردا بوو، لەگەڵ شەپۆلی هاتنی شیوعیەتو هەڕەشەکانی چەکە ناوەکییەکانو کێبڕکێی چەکدارییەکان، ئەو دەیویست مەسەلەکان چارەسەر بکات، هەر ئەو دەتوانێت لە قەیرانی مووشەکەکانی کوبا دوورمان بخاتەوە.

لە ساڵی یەکەمیدا کەنەدی هەڵەیەکی مەزنی لە مامەڵەکردن لەگەڵ کوبیەکان کرد. بەتایبەتی لە کێشەی دورگەی بەرازەکان، کە تێیدا لە رۆژی ٧ ی ئەپریلی ساڵی ١٩٦١دا دەستەیەك لە نەیارانی کاسترۆ پلانیان دارشتبوو شەڕی حکومەتەکە بکەن، ئەو پشتیوانی ئەو دەستەیەی کردبوو. پاش ئەو نسکۆیەو سەرنەگرتنی هێرشەکە، هەڵەی دووەمیش دەکات ئەویش کە لە دیمانەکەی لەگەڵ خروشۆفدا سەرناکەوێت، هۆی سەرنەگرتنی دیمانەکەش بە تەنها لە ئەستۆی ئەودا بوو. من وا دەزانم هۆکاری کەم ئەزموونی تاکە هۆکاری سەرنەکەوتنی ئەو دوو کێشەیە نەبوو، بەلکو رەگی نەخۆشییەکەی ئەوو باری نالەباری تەندروستی هۆکارێك بوون. ئەگەرچی ئەو دەستەیەی لەگەڵ ئەودا کاریان دەکرد، دان بەوەدا نانێن کەوا ئەو مەزندەیە راست بێت، بەلام کە (ریتشارد ریگز) رۆژانەو بەسەرهاتەکانی ئەو سەرۆکە گەنجەی نووسیوەتەوە. ئەو دەڵێ، زۆربەی ئەو راپۆرتانەی کە باس لە نەخۆشییەکەی سەرۆك دەکەن راستن.

## نەخۆشیو چارەسەرییەکان

من وا دەزانم کە رەوشی تەندروستی سەرۆك هەر لە سالّی ١٩٦١ وە باش نەبوو، بەلاّم وامدەزانی لە سالّی ١٩٦٢ باشتر دەبێت، ئەو گۆڕانەو نەخۆشییەکە رۆڵی هەبوو لە سەر وزەو دەسەلاّتی سەرۆك لە رۆژانەی هەردوو قەیرانی دورگەی بەرازەکانو مووشکە کووباییەکان.

زۆر ئامۆژگاری کەنەدی کرابوو، بۆچوون زۆربوون لە سەر هاوکاریکردنی نەیارەکانی دەسەلاّتی کاسترۆ، پێشبینی بۆ سەرکەوتنی ئەو پەلاماردانە زۆر لاوازبوو، بەلاّم کەنەدی لە دورگەی بەرازەکان سووربوو لە سەر نەبەردییەکە، ئەو حیسابی کێشە ناوخۆییەکانیشی دەکرد، دەیویست خۆی وا نیشانبدات کەوا سەرۆکێکی بەهێزەو لە ئایزنهاور کەمتر نییە، رۆبرتی براشی هاوبیربوو لەوەی لەگەڵ کوبا توندو بەزەبر بێت، براکەی رقی زۆری لە کەسایەتی کاسترۆش هەبوو، پاشانیش دەستی هەبوو لە هەوڵێك بۆ کوشتنیشی.

## پەلاماردانێکی بێ بناغە...!

لە سەعات هەشتی بەیانی رۆژی ١٥ ی ئەپریلی ١٩٦١ دا، هەشت فڕۆکەی جەنگی جۆری بی ٥٢ لە نیکاراگوا هەڵدەستێتو فڕۆکەخانە سەربازییەکانی کوبا بۆردومان دەکەن لە کۆی ٣٦ فڕۆکەی جەنگی ناو فڕۆکەخانەکە پێنجیان دەسووتێنن. هەر لەو پلانەشدا فڕۆکەیەکی ئەمریکی بە مۆرو هێمای کوبا لە نیکاراگوا بەرەو میامی دەفڕێت،

مەبەستیش لەوە ئەوەبوو کەوا بڵێن فڕۆکەوانێکی کوبی فڕۆکەیەکی فڕاندووەو لە میامی نیشتۆتەوە. لە بارەگای نەتەوە یەکگرتووەکان نوێنەری ئەمریکا ئەو هەواڵە بەدرۆ دەخاتەوە کە سوپای ئەمریکی پەلاماری کوبای دابێت، ئەو وتبووی ئەو فڕۆکانەی فڕۆکەخانەکانی کوبایان بۆردومان کردووە، ئەمریکی نەبوون، بەڵام فڕۆکەی خۆیان بووەو نەیارەکانی کاسترۆ هێرشەکەیان ئەنجامداوە، دیارە نوێنەرەکەی ئەمریکا ئاگاداری ئەو رووداوە نەبووەو هیچ زانیاریشی نەبووە، ئەگەر سەرۆك کەنەدی داوای لێ نەکردبوایە، ئەو لەوەی کە ئاگاداری ئەو رۆژە نەبووە ئیستقالەی دەدا، کە پاشان راستییەکە دەزانێت توورەبوونەکەی سارد دەبێتەوە.

لە ئەنجامی پەلاماردانەکەی سەر ئەو دورگەیە، کەنەدی شکست دەخوات و هەزار و سەد کەسە کوبیە نەیارەکەی کاسترۆش خۆیان دەدەنە دەست، هێزە ئەمریکییەکان و ناتوانن ١٤ چەکدارە گەمارۆدراوەکەش رزگار بکەن. کەنەدی دەیویست هەڵەو هۆکارەکانی شکستەکەو رووداوەکە بخاتە ئەستۆی خەڵکانی ترەوە، بەڵام لەوەیاندا خۆی هەڵدەخەڵەتاند، یەکێك لە شارەزاکان ئەو بڕیارەی کەنەدی و ئەو گیانبازییەی بە حیساباتی هەڵە پێناسە کردبوو. یەکێك لە کەسە نزیکەکانی کۆشکی سپی وتبووی: سەرۆك کەنەدی کەسێکی بە زەبرو بە هێز نەبوو، وەك چۆن وێناکرابوو، مەزاجی بە جۆری دەرمان و چارەسەرییەکانی دەگۆڕا، رێك ئەوەی لە قەیرانەکەی بەنداوی بەرازەکان لەسەر دەچەسپا.

# ئێسکێکی تەڕ

که پەلامارەکەی سەر کوبا سەرناگرێتو بەرنامە ئەمریکییەکە شکست دەخوات، سەرۆکی سۆڤیەتی خرۆشۆف گاڵتەی پێدەکات. سەرۆك کەنەدی بە ئێسکی تەڕو ناسك دەشوبهێنێت، پێی دەڵێت کەوا ئەو بێ ئەزموونەو بەرگەی رووداوەکان ناگرێت. بەلام پاش ١٨ مانگ لەو رووداوە کە قەیرانەکەی مووشەکە کوباییەکان سەرهەڵدەدات، ئەو بە شێوەیەکی ترو زۆر جیاوازتر لە جاران دەجوڵێتەوە، بەتایبەتی کە داوا دەکات دەستەیەك لە راوێژکاران بۆ دانوستان لە سەر ئەو پێشهاتە کۆببنەوە. گۆڕانەکە تەنها لە بەڕێوەبردنی قەیرانەکە نەبوو بەس، سەرۆك لە قەیرانەکەی دورگەی بەرازەکانیش ئەزموونی وەرنەگرت، بەڵکو گۆڕانەکە لەوانە قووڵتربوو ئەویش پەیوەندی بە ردوشی تەندروستی سەرۆكو چارەسەرییەکانی نەخۆشییەکەیەود هەبوو، لەگەڵ هەموو کەموکوڕییەکانو شکستەکان لە پەلاماردانەکەی دورگەکەو قەیرانی مووشەکە کوباییەکان، دەبێ لەو دوو پێشهاتەدا تەندروستی سەرۆك رەچاو بکەین.

هەموو تۆمارەکانی تەندروستی بنەماڵەی کەنەدی لەبەردەستدا نییە، بەلام من لێکۆڵینەوەم کرد لە هەموو ئەوانەی لەناو کتێبخانەکەی پارێزراو بوون، بە تایبەتی ئەو راپۆرتانەی ساڵانی ١٩٦١و ١٩٦٢، لەوانەوە دەردەکەوێت کەوا تەندروستی سەرۆك رۆڵی زۆری هەبووە لەسەرۆکایەتی کردنەکەی ئەودا. لەوانە دیارە کەوا تەندروستی ئەو لەسەردەمی منالّییدا جێگیر نەبووە، ئەو لەساڵی ١٩٢٠و لە تەمەنی سێ ساڵیدا لەبەر نەخۆشی تای قرمزی لە

نەخۆشخانە نووستوە. لە تەمەنی ١٣ ساڵیدا کێشی دادەبەزێت و گەشەی سست دەبێت، لە ساڵی ١٩٢٤و لە تەمەنی ١٧ ساڵیدا لە نەخۆشخانەی مایوکلینك و لە بەر هەوکردنی قۆلۆنی بۆ ماوەی یەك مانگ دەمێنێتەوە. هەندێکیش وایان دەزانی لە سکیدا نەخۆشی تری هەیەو لە ساڵی ١٩٣٧ ەوە بۆ کەمکردنی ژانی قۆڵۆنی چارەسەری کورتیزنی وەرگرتووە. رەنگە لەودەمانە نەخۆشی HYPOADRINALISM هەبووە. کەنەدی بەردەوام ژانە پشتی هەبوو، رەنگە ئەوەشی لە پاش وەرگەڕانی ئوتومبێلەوە تووشی بووە کە لە تەمەنی گەنجییەوە روویداوە، هەندێکێش وا دەزانن ئەو نەخۆشییەی لە ئەنجامی دەرمانی STEROID کە زۆر بەکاریهێناوەو یان هەردووکیانەوە تووش بووە.

## کۆڵۆنی دوازدە گرێ

لە رۆژی ٢٢ ی نۆڤمبەری ١٩٤٣ لە پشکنینێکی پزیشکیدا دەردەکەوێت کەوا سەرۆك کەنەدی تووشی قورحەی (کۆڵون) دوازدە گرێ بووە، رەنگە ئەوەشی لە ئەنجامی بەکارهێنانی دەرمانی ستیرویدەوە بووە، بەردەوامیش ژانە پشتیشی هەبوو، لە چەندین نەخۆشخانە پشکنینیان بۆ کردووە، لە نەخۆشخانەی نیو ئەنگلاند لە رۆژی ٢٢ی یونیۆی ساڵی ١٩٤٤ نەشتەرگەرییان بۆ کردووە، لەوێ دوای نەشتەرگەریەکە بۆی ڕووندەبێتەوە مەزندەکەیان راست دەرنەچووەو ئەو دیسکی نەبووە. لە ئەنجامی پشکنینێکی وردا دەرکەوت کەنەدی

لاوازی لە (غضروفي) کرکراگەی ریشەیی هەیە، رەنگە ئەوەش لە ئەنجامی بەکارهێنانی دەرمانی ستیرۆیدەوە بووە، لە ئۆکتۆبەری ساڵی ١٩٤٤ دەرزی پرۆکاینیان لە دەمارەکانی لای چەپی پشتی کەنەدی دابوو، ئەوەش ماوەیەك بووەو مەبەستیش لە کەمکردنەوەی ژانی پشتی بووە کە بە هۆیەوە زۆر دەینالاند.

زۆربەی دکتۆرەکان گەیشتنە ئەو رایەی کە زووتر دکتۆرێکی هێزی دەریاوانی پێشبینی کردبوو کەوا نەخۆشییەکەی ئەو کۆنەو لە مێژەوە ئەو نەخۆشییەی هەیە. ئەنجومەنی تەندروستی هێزەکانی دەریاوانی لە رۆژی ٢٧ی دێسەمبەری ساڵی ١٩٤٤ رایگەیاندبوو، کەوا کەنەدی تووشی ژانەسك هاتووە لە ئەنجامی مانەوەی ٥٠ سەعات لەناو ئاو و ماوەی یەك هەفتەش ئاوی نەخواردۆتەوە، بۆیە ناوی کەنەدی دانراوە کە لە ١ی مانگی مارسی ساڵی ١٩٤٥ خانەنشین بکرێت، چونکە رەوشی تەندروستی باش نییە. لە نێوان ساڵانی ١٩٤٥ تا ١٩٤٧ کەنەدی ژانی گەدەو پشتی هەبووە، زووتر لە ساڵی ١٩٤٤ مەلاریای هەبووە پاشان مەلاریاکەی بۆ گەڕاوەتەوە، بۆ یەکەمجار لە ساڵی ١٩٤٧ تووشی نەخۆشی ئەدیسون بووە کە لەلایەن دکتۆر سیر (دانیال دیڤیس) ەوە نەخۆشییەکەی دۆزراوەتەوە، ئەودەمانە ئەو ئەندامی کۆنگریس بووە لە سەر ویلایەتی ماساتیوشیش. پێش ئەوەی لە ساڵی ١٩٣٧ بچێتە نەخۆشخانەی لەندەن لینیك، دە ساڵ بوو جۆرەها نەخۆشی هەبووە. لە ساڵی ١٩٤٧ ەوە نەخۆشییەکانی سەرسوڕانو تاو ماندبوونو لاوازیو کەمی کێشو زەردبوونی پێستی هەبووە، لەبەر هەر هۆکارێك بووبێت دەرمانی کوریتسولی وەرنەگرتووە.

## یەك ساڵی تر نازی

که له لهندەن نهخۆشییهکهی دهدۆزرێتهوه، دکتۆرەکان مهزنده دهکهن کهوا کهنهدی له یهك ساڵی تر زیاتر نازی، له گهشتهکهیدا له لهندەنهوه بۆ ویلایهته یهکگرتووهکان له ئۆکتۆبهری ساڵی ١٩٤٧ ژانی زۆر دهبێت، ژانهسهرو ههوکردنی سینگو گهدهو میزڵدانی دهبێت، که له ساڵی ١٩٥١ سهردانی ژاپۆن دهکات نیشانهی نهخۆشی ئهدیسۆنی لێ بهدەر دهکهوێت. له مانگی یۆلیۆی ساڵی ١٩٥٣ له نهخۆشخانهی زانکۆی واشنتۆن دهمێنێتهوهو ژانهپشتی زۆرتر دهبێت. له ١٢ی سێپتهمبهری ساڵی ١٩٥٣ کهنهدی لهگهڵ (جاکلین بوڤیر) پرۆسهی هاوسهرگیری دهکات، له مانگی ئهپریلی ساڵی ١٩٥٤هوه له لاهای کلینیك تیشکی پشتیان گرتبوو، له وێنهکهدا دهرکهوتبوو، کهوا جومگهی پێنجهمی خوارەوەی بربرەی پشتی خوراوه، له مانگی ئۆکتۆبهری ههمان ساڵدا نهشتهرگهرییهکیان به سێ سهعات بۆ کردبوو، تێیدا پارچه کانزایهکیان بۆ بههێزکردنی پشتی دانابوو، سهرهتا شتهکان ههموو باش بوون، بهلاَم له رۆژی سێیهمیدا ههستی به ژانێکی دژوار کردبوو، ژانهکه کوشنده دهبێت ههتا دهرمانهکانی نارامکردنهوهکانیش سوودیان نهبوو، بۆیه کهنهدی دهبوورێتهوهو له مانگی نۆڤهمبهری ساڵی ١٩٥٥ نهشتهرگهرییهکی تری بۆ دهکهن، تا پارچه کانزاکهو بورغی نهشتهرگهرییهکهی بۆ دهربهێنن، چونکه ئهوەیان ئازاری زۆری داوەو ههراسانی کردبوو، هاولاَتیانی ماساتیوشیش دهیانزانی کهنهدی نهشتهرگهری پشتی بۆ کراوه، بهلاَم نهیاندهزانی کهنهدی نهخۆشی ئهدیسۆنیشی ههیه.

## تاقیکردنەوەی ئازایەتی

ئەنجامــدانی دوو نەشــتەرگەری بــۆ پشــتی کەنــەدی، ئازایــەتیو خۆڕاگری ئەوی دەگەیانــد، بــەرگریو ورەی بــەرزی ئــەو کەســانە بۆتــە ئەزموونێك بۆ سازکردنی کتێبێــك لەســەر کەسایەتییە مێژووییــەکان، کــە لــە ژیانیانــدا ئازایــەتییان نوانــدووە، ئــەوەی تۆمــاری نەخۆشــیو بوارەکانی چارەسەرییەکانی ئــەو بزانێــت، زۆرتــر بــە کەنــەدی سەرسام دەبێت. کە ئەمریکییەکان دەنگیان بە کەنەدی دابوو، هەر ئەوەنــدەیان دەزانی کەوا دەنگیان بــە گــەنجێکی تەندروســتی بــاشو ســەلامەت داوە. کە لە ڕۆژانی هەڵمەتی هەڵبژاردنەکاندا لــە دیمانــە تەلەفزیۆنییەکانــدا ڕووبــەڕووی ریتشــارد نیکســۆن دەبێتــەوە، ئــەو وەك گــەنجێکی فــۆرم جوانو تەنــدروستو بە ورە، لە ڕووی نیکسۆنی ماندو دەوەستا، کە بــە ردێنی نیو تاشراو ئارەقەی لێ دەتکا دەردەکەوت. لە ماوەی هەڵبژاردنە ســەرەتاییەکانی حیزبــی دیموکراســیو هەڵبژاردنــەکانی ســەرۆکایەتی ساڵی ١٩٦٠، دۆســتو هەڤاڵەکانی نکوڵی ئــەومیان دەکــرد کــەوا کەنــەدی نەخۆشــی ئەدیســۆنی هەیــە، هۆکارەکــەش ڕوونو ئاشــکرابوو کــەوا کەنەدی خۆی نکوڵی لە نەخۆشییەکەی دەکرد.

لە نۆڤەمبەری ساڵی ١٩٦٠ داو لە پاش هەڵبژدنەکەی ســەرۆکایەتی ڕۆبرت کەنەدی رازی دەبێت تەنها کەمێك زانیاری لەســەر تەنــدروستی سەرۆکە هەڵبژێردراوەکە بدات. لە ژمارەی مانگی نۆڤەمبــەری گۆڤــاری TODAYS HEALTH وتارێك لەلایــەن (جانیــت ترافیــل)و (یــوجین کــۆهین) لەســەر نەخۆشی ئەدیسۆن بڵاودەبێتــەوە، ئــەوەش هێمایــەك دەبێت بۆ نــەخۆشییەکەی ســەرۆك، بــەڵام ئــەو دوو نووســەرە دەبووایە

چل ساڵ چاوەڕوانیان کردبووایە تا راستییەکانی تەندروستی سەرۆکیان بە هەموو وردەکارییەکانەوە بزانن. هێشتنەوەی نهێنییەکانی نەخۆشییەکەی ئەو تەنها بۆ هاوڵاتیانی ئەمریکی نەبووەو بەس، بەڵکو ئەوەندە نهێنی بووە کەسە نزیکەکانی، یاریدەرەکانیشی وردەکارییەکانی نەخۆشییەکەی ئەویان نەدەزانی، بازنەیەکی سنووردار لە دکتۆرەکان و هاوسەرەکەی و رۆبرتی برای و باوکی دەیزانی کەوا ئەو نەخۆشەو چۆن و چ دەرمانێك وەردەگرێت. ژنێکی دکتۆر بە ناوی (تراڤیل) دەچێتە ناو کۆشکی سپی و دەبێتە دکتۆری تایبەتی سەرۆك، ئەو لە بیرەوەرییەکانیدا نووسیویەتی، کەوا رۆژێکیان سەرۆك بە منی وتبوو، کەوا نووسەری پەیامەکانم و کەسە نزیکەکەم (تید سورنسین) تاکە کەسە هەموو شتێك لەسەر نەخۆشیەکەم دەزانێت. بۆیەش سەرۆك بە دکتۆرەکەی وتووە، بۆ پرسیارکردن لەسەر نەخۆشیەکەم دەکرێ پرسیار لەو کەسە بکرێت، تەنها ئەو هەموو وردەکارییەکانم دەزانێت.

دکتۆر تراڤیل دەڵێت تا مردنی سەرۆك هەموو وردەکارییەکانی نەخۆشییەکەی بەنهێنی ماوەتەوە. دکتۆرەکەی دەرمانی پرۆکاینی PROCAINE بۆ دەنووسی، ئەو دەرمانەش کاردانەوەی نەگەتیڤی لە سەر تەرکیزکردن و ماندبوون و گۆڕانی مەزاج و دوودڵی و لاوازی و نیگەرانی و هیلاك بوون هەبوو، ئەوانەش هەموو لە رەوش و رۆژانەی سەرەتایی سەرۆکی لە کاتی بەڕێوەبردنەکە دیاربوون. سەرۆك بۆ کەمکردنەوەی ژانەپشتەکەی رۆژانە پێنج جار بە ئاوی گەرم خۆی دەشووشت و کورسییەکی تایبەتیشی بەکارهێناوە، بێجگە لەوانەش

دەرزی PROCAINE رۆژانــە ســێ هــەتا شــەش لــە خــوارەوەی پشــتی خۆی داوە. لە ناو تۆمارەكانی دكتۆر تراڤیلدا نووسـراوە كـەوا سـەرۆك كێشـەو ژانـی لـە گـەدەو قۆلـۆنو پرۆسـتاتو تـای زۆرو وشـكبوونەوە Abscessesو خەوزڕانـدنو بەرزبوونـەوەی كۆلسـترۆڵی خـوێن، ئەوانـەو ژانەپشـتی زۆریشـی هـەبووە. كەنـەدی بـۆ چارەسـەرییەكان دەرمانی زۆر وەرگرتووە. دەكرێ بگوترێ ئەو دەرمانانە رۆڵی هـەبووە لەسەر بڕیارەكانی ئەو لەسەر قەیرانەكەی دورگـەی بـەرازەكان...؟ بـۆ چارەسەری ئەو لە نەخۆشی ئەدیسۆن TESTOSTERONC دەرمـانی وەرگرتووە. ئـەوەش هەنـدێ جـار سـەرۆكی بـەرەو تونـدكاریو هەسـتی دژواریو دوژمنایەتی بردووە.

لەگـەڵ نزیكبوونـەوەی كـاتی پەلامارەكـەی دورگەكـە، كەنـەدی رەوشی هیلاك بووە، رەوشی ئەوەندە ماندوو دەبێت دكتۆرەكان ناتوانن بڕیـار بـدەن كـەمێكی گونجـاوی لـە سـتیرویدو تسنوسـترۆن بدەنـە نەخۆشەكەیان. كەنەدی هەر لـە سـاڵی ١٩٤٠ەوە دەرمـانی بـۆ نـەخۆشـی میزڵدانیش وەرگرتـووە. كـە بـە فـەرمانی ئـەو پەلامارەكـەی كوبـا لـە رۆژانـی ١٧و ١٨ ی ئـەپریلی سـاڵی ١٩٦١ دەكرێـت، دەبـێ شكسـتەكە چ كاریگەری لەسەر تەندروستی هەبووبێت...؟

## لێکهەڵوەشانەوەکە

بۆ وەڵامدانەوەی پرسیارەکەی سەرەوەمان دەڵێین، ئەو لە ئەنجامی ئەو رووداوەو هەرەسەکە، تووشی رەشانەوەیەکی زۆرو هەوکردنی میزڵدان بووە. لە کاتی رووداوەکەش سەرۆك دەرمانی زۆری وەرگرتووە. لە رۆژی دواتر وەزیر (شیستر باولز) بەشداری لە دانیشتنی حکومەت بە سەرۆکایەتی سەرۆك دەکات. لەوێ سەرۆکی دیوە کە بە یەکجاری لێکهەڵوەشاوەتەوە. ئەودەمانە ئەو قسەی هەموویانی بە بێ مانا دەربڕیوە. قسەی لەبەرخۆی کردووە، لە قەیرانەکە خەوی لێ نەکەوتووەو تەنگژەکەی زۆر مەزن بووەو دەکرێ بڵێین توندترین قەیران و نارەحەتیەکانی ئەو بووە. بەردەوامیش لەگەڵ باوکی بە تەلەفۆن قسەی کردووە. ئەودەمان لە کەسێکی سەرکردەی باڵای هێزە چەکدارەکان نەدەوەشایەوە.

لە بەڵگەنامەکانی پنتاگۆندا دیارە کەوا سەرۆك کەنەدی لە کۆبوونەوەی ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوەیی رەزامەندی لەسەر هەنگاوە نهێنییەکانی ڤێتنام دەربڕیوەو بۆیە هێزە تایبەتییەکان لە پاش چەند هەفتەیەك لە ڤێتنامی باشوور دەکشێنەوە، هەندێك رایان وایە لەودەمانەوە بڕیارە ترسناکەکە دەردەچێت و شەڕەکە لە ڤێتنام گەرم دەبێت. سەرۆك لە رۆژی پێشتر کاری سێکسیشی لەگەڵ یەکێك لە دۆستەکانی لە شیکاگۆ کردووە، ئەگەرچی ئەو لە رووی جەستەیی و عاتفییەوە بە هیچ شێوەیەك ئامادەیی لەسەر بڕیارەکان نەبووە.

# بەشی یازدەهەم

## ئەو دکتۆرەی چارەسەری کەنەدی دەکرد، مۆڵەتی کاری نەمابوو

لە ماوەی مانگی مایۆی ساڵی ١٩٦١ دووبارە کەنەدی لە لای دکتۆر (ماکس جاکویسون) چارەسەر وەردەگرێتەوە، کە لە ماوەی هەڵمەتی هەڵبژاردنەکاندا سەردانی دەکرد، ماکس دکتۆرێکی ئاسایی نەبوو، ناوبانگی بەوە دەرکردبوو کە لە کلینکی خۆی لە نیویۆرك چارەسەری کەسە ناودارەکانو دەوڵەمەندەکانی دەکرد. ئەوانەی دەیانویست وزەو تاقەتی سێکسییان بزانن، تێبگەن هەر گەنج ماون یان پێویستیان بە داوو دەرمان هەیە...!

دکتۆرەکە بەپێی چەندین راپۆرت هەر لە ساڵی ١٩٧٥ ەوە مۆڵەتەکەی لێ وەرگیراوەتەوەو بەوەش تاوانبارکراوە کە دەرزی قەدەغەکراوی لە نەخۆشەکانی داوە، بەلاَم ئەوەش ئاشکرا نەکراوە کە سەرۆك کەنەدی تەنها لە ساڵی ١٩٧٢ لەلای دکتۆر جاکوسون چارەسەرکراوە، ئەوەش لە وتارێکی رۆژنامەی نیویۆرك تایمزەوە هاتووە. ئەگەرچی کەسە نزیکەکان لە سەرۆك کەنەدی نکۆڵی لەو هەواڵە دەکەن، بەلاَم کە (رۆبرت والیك) لە ساڵی ٢٠٠٢ ژیاننامەی ئەو بلاَودەکاتەوە، نووسیویەتی، کەوا سەرۆك کەنەدی لەلای ئەو دکتۆرە دەرزی ئارامکردنەوەی لێدراوە، ئەوەشی لە ناو راپۆرتە نهێنییەکانی ناو تۆمارەکانی نەخۆشخانەکانەوە دەرهێناوە.

## سەرۆك لە ماسولکەکانی ئاسوودەیە

لەناو بیرەوەریـەکانی دکتـۆر جاکویسـون، کـە بلاونەکراوەتـەوە بەشێکی تەرخانە بۆ تەندروستی سـەرۆك کەنـەدی، لەوێ دیـارە کەوا دکتۆرەکە پێشەنگی چارەسەریەکانی نیگەران و هیلاکبوونی ئـەو بـووە، لە پاش ئـەوەی کەنـەدی بـۆ جـاری یەکەم لـە کلینکەکەی خۆیـدا لـە مـانگی سـپتەمبەری سـالّی ١٩٦٠سـەردانی ئـەو دکتـۆرە دەکـات، لـەوێ دکتۆرەکە دلّنیای دەکاتەوە کەوا ماسولکەکانی بەهێزن، بەوەش هەست بـە خۆشـیو کامـەرانی دەکـات کـە دەزانێـت ماسـولکەکانی بـەهێز بوونەتەوە. بەلاّم دکتۆرەکە باسی ئەوە ناکات چ جـۆرە دەرمـانێکی بـە سەرۆك کەنەدی داوە، بەلاّم دیارە کەوا ئـەو دەرزی ئارامکردنـەوەی بـە نەخۆشەکانی داوە، بەتایبـەتی ئـەو دەرمانـەی بـە دەسـتی خـۆی سـازی دەکردن، کە ناوی نابوو (ئێکس ئا ئێم) کە بریتییە لـە تێکەڵەیـەك لـە ئارامکردنەوەو سیترۆید. دکتۆر جاکویسون باسی ئـەوە ناکـات کـە ئـەو جۆرە دەرمانەی بە کەنەدی داوە، ئەگەرچی ئەوەیان زۆر ئاساییە.

## ئێف بی ئای دەرمانەکە دەدۆزێتەوە

سـەرۆك کەنـەدی لـە نێـوان رۆژانـی ١٦ تـا ١٨ ی مـایۆی سالّی ١٩٦١ سەردانی کەنـەدای کـردووە، کـە بـۆ چـاندنی نـەمامێك. زەوی کۆلّیـوەو ژانەپشتی تووش بووە، بەلاّم ترافیل باسی ئەو ژانەی نەکردووە، تـەنها

ئاماژەی بەوە داوە کەوا سەرۆك ماندووە، رەنگە ئەو بۆ چارەسەریش دەرمانیشی وەرگرتبێت، بەڵام بە رەسمی لە بیرەوەرییەکانیدا ئاماژەی بەو چارەسەرییە نەداوە، ئەگەری ئەوە هەیە ئەو راپۆرتانە نەدۆزرابنەوە. دکتۆر جاکویسون نووسیویەتی کەوا ئەو هاوسەری سەرۆکیشی چارەسەرکردووەو سەرۆکیش لە کەنەدا داری چاندووە ژانەپشتی بەهێزی تووش بووە، بۆ کەمکردنەوەی ژانەکەو گونجانی هێزو وزەی لەگەڵ ماندبوون ئامۆژگاریو چارەسەری کردووە، بەوەش پێویستی بە دەرمانی ئارامکردنەوەو سیروید هەبووە، دەڵێن ئێف بی ئای پێنج شووشە دەرمانی لەناو کۆشکی سپی دۆزیوەتەوە، پاش ئەوەی شووشەکان پشکێنراون دەرکەوتووە لەناو شووشەکاندا ئاوێتەی ئارامکەرەوەو ستیرویدیان تێدابووە. پاش ئەوەی لە مانگی مایۆی ساڵی ١٩٦١ سەرۆك کەنەدی چارەسەرییەکان وەردەگرێت دەتوانێت برِوات، بە قسەی دکتۆر جاکویسون سەرۆك وتبووی هەستدەکەم تەندروستیم باشەو داوای لێکردووە لە هەفتەی داهاتوو بە یەکەوە سەفەرێکی ئەوروپی بکەن، لە راپۆرتەکانەوە دیارە کەوا کاتی روودانی پەلامارەکەی دورگەی بەرازەکان ئەو هیچ جۆرە دەرمانێکی وەرنەگرتووە، بەڵام رەنگە لە کاتی کۆنگرە لووتکەییەکەی لەگەڵ خرۆشوف، یان پاش کۆنگرەکە، یان دوو هەفتە پێش قەیرانەکە دەرمانی وەرگرتبێت. ئەوەی شایانی باسە لە تێبینییەکانی ترافیلیدا ، بە هیچ شێوەیەك ناوی دکتۆرەکەو دەرمانەکان نەهاتووە.

## نیگەرانییەکی زۆر

لــە هـاوینی سـالّی ١٩٦٢ ەوە رۆبـرت کەنـەدی بـرای سـەرۆك لــە پەیوەندییەکەی کەنەدی بە دکتـۆر جاکویسون زۆر نیگـەران دەبێـت، بۆیـە داوا لـە ئێـف بـی ئـای دەکات ئـەو دەرمانانـەی کـە لەلایـەن ئـەو دکتـۆرەوە دەدرێتـە براکـەی تـەحلیل بکـەن، پـاش ئـەوەی دەرمانەکـە تەحلیل دەکەن، رازی دەبن تا پایزی سالّی ١٩٦٢ ئەو دەرمانە وەرگرێـت، بۆیە دکتۆرەکە دەرمانە ئارامکەرەوەکانو ستیرونی بـە بـەردەوامی بـە کەنەدی داوە، بەتایبەتی کە لە سەفەرەکەی ئەوروپا هاوشانی بـووە لـە پاریسو ڤییەناو لەندەن، ئەوەش ببووە جێگەی نیگـەرانیو نـارەزایی دکتۆرەکانی ناو کۆشکی سپی. نارەزاییو نیگەرانییـەکان سەبارەت بـە چارەسـەریەکانی جاکویسـون، بـە هـیچ شـێوەیەك کـاری لـە کەنـەدی نەکردووە.

## پرسیارێکی گرنگ

سـەبارەت بـە مەسـەلەی پرسیارە گرنگەکـەش ئەوەیـە، ئایـا ئـەو چارەسـەریە سـەرکەوتوو بـوو...؟ هـەموو نیشـانەو بەلگـەکان ئـەوە دەسەلمێنن کەوا دەرمانەکان و بۆچوونەکانی کەنـەدی لـە کۆبوونـەوەی لووتکـەیی لەگـەلّ خروشۆف، رۆلّـی خراپبـان هـەبووەو شکسـتیان بـەو داوە. تـەنها یـەك دکتـۆر سەرپەرشـتی رەوشـی تەندروسـتی کەنـەدی نـەکردووە. قسـەیەك لەسـەر کەنـەدی هەیـە، کـەوا سـەرۆك کەنـەدی

چەند شەیدای زۆری ژنان بووە، ئەوەندەش شەیدای زۆری دکتۆرەکانیش بووە، ئەگەر ئەو قسەیەش راست بێت. جاکویسۆن دەڵێت، بەیانییەکیان سەردانی سەرۆك کەنەدیم دەکرد، کە چووم بینیم شووشەیەك دەرمانی دیمبرولی لە پێشە، کە ئەوەش جۆرێکە لە مۆرفین، ئەوەشم لە ناو گەرماوەکەی ئەو دۆزیوەتەوە، دیارە سەرۆك خۆی ئەو دەرزییەی لە خۆی داوە، دکتۆر جاکویسۆنیش زۆر دژی ئەوەبووە کە ئەو جۆرە دەرمانانە بەکاربهێنێت، بەڵام کەس زانیاری ئەوەی نییە کە سەرۆك چەند خووی بە دەرمانی دیمبرول گرتبێت، یان دەرمانی تری لەو جۆرەی وەرگرتبێت.

دەڵێن سەرۆك کەنەدی لەسەر داوای خۆی‌و پێش کۆبوونەوەکەی لەگەڵ سەرۆکی سۆڤیەتی نیکیتا خرۆشۆف بۆ کەمکردنەوەی ژانەپشتی تا بتوانێت چوار سەعات خۆی راگرێت، ئەو دەرمانەی وەرگرتووە، بۆیەش کەنەدی داوای لە دکتۆر جاکویسۆن کردبوو لە کاتی ئامادەبوونی لە ئاهەنگێکی مۆزیکی لە نۆڤەمبەری ساڵی ١٩٦١ لە کۆشکی سپی هەمان چارەسەرییەکەی ڤییەنای بداتێ. کە لە کۆبوونەوەکەی ڤییەنا تەواو دەبێت یەکسەر کەنەدی بەرەو لەندەن بەرێ دەکەوێت تا لەوێ لەگەڵ سەرۆك وەزیران هارۆڵد ماکمیلان کۆببێتەوە، لەوێش بە قسەی دکتۆر جاکویسۆن ئەو دەرمانەی کە پێش کۆبوونەوەکە وەرگرتووە، لە ماڵی مێردی خوشکی جاکی کەنەدی ماوەتەوە کە دەکاتە شازادە ستانسلۆ رادزویل، بۆ بەیانییەکەی کەنەدی بە فڕۆکەیەکی سەرۆکایەتی دەگەڕێتەوە واشنتۆن، دکتۆرەکە لە سەر پشتی فڕۆکەکە دەرزییەك لە سەرۆك دەدات.

# ئەو بەبێ ژن چۆن دەگوزەرێنێت...؟!

لـە یەکـەم دانیشـتنی کۆبوونـەوەکـەدا مـاکمیلان هەسـتیکردبوو کەنەدی ژانەپشتی هەیەو ماندوو دەبێت، بۆیە ماوەیەك کۆبوونەوەکە رادەگرێـت، لـە ژوورێکـی ئاسـاییدا دەمێنێتـەوەو قسـەی سادەو لاو... دەکەن، تا سەرۆك پشوویەك بدات، ئەوەش بۆ ئەوە بـوو کـەس ... بەوە نەکات کەوا میوانەکەیان باری تەندروستی بـاش نییـە، بەیەکـەوە لـە سـەعات یـازدەو نیـوی بەیانییـەوە تـا سـەعات سـێی نیوەشـەو سەندەویش‌و ویسکی دەخۆنەوە، لەوێ کەنەدی بە هاوڕێیەکەی وتبـوو. کـەوا سـەرۆکی سـۆڤیەتی چـەند قسـە لـە رووە. ئەگەرچـی ئـەو دوو سەرکردەیە لە تەمەندا زۆر جیاوازبوون، هەڵوێستەکانیان لە یەکتریش جیـاوازبوون، بـەڵام کەنـەدی‌و مـاکمیلان زۆر هـاورێ بـوون، باسـی زۆر مەسەلەیان کـردووە، تـا گەیشـتۆتە بابـەتی ژنـیش، بۆیـە رۆژێکیـان لـە ماکمیلانی پرسـیوە، من تێناگـەم چـۆن تـۆ بـێ ژن دەحەوێیتـەوە، من ئەگەر سێ رۆژ بێ ژن بم ژانەسەر دەمگرێـت. رۆژێکیـان خروشـۆف بـە شێوە هۆڤیانەکەی خۆی وتبووی:

بەرلین بۆ خۆرئـاوا وەك گون وا بـوو، هـەر دەمـێ خۆرئاواییـەکان ویستیان هاوار بکەن، ئێمە دەیگوشین.

بەڵام لە بەڵگەنامەکاندا وادیـارە خروشـۆف (١٧ی ئـەپریلی ١٨٩٤ ـ ١١ی سـێپتەمبەری ١٩٧١) مەبەسـتی شـەڕ نـەبووەو حـەزی بـە نائـارامی نەکردووە، بەڵکو ئارامی ئەوروپای ویستوە تا دان بە کۆماری ئەڵمانیای خۆرهەڵاتدا بنێن. کۆبوونەوەی لووتکـەیی نێـوان کەنـەدی‌و خروشـۆف لـە ڤییـەنا خـاڵێکی وەرچـەرخان بـوو بـۆ سـەرۆکی ئـەمریکی، پـاش

قەیرانەکەی دورگەی بەرازەکان کەنەدی گلەیی لە کەسانی تر دەکرد، بەڵام پاش ئەو کۆبوونەوەیە هەستیکردبوو ئەو هەڵەی کردووەو کەسی تر دەستی لەو قەیران‌و تەنگژەیەدا نییە، خۆی تەنها بەرپرسە. کەنەدی بەشانازییەوە دەیگوت من سروش لە ئەبراهام لینکۆڵن وەردەگرم، کە وتوویەتی:

من دەزانم خودا هەیەو بەر لە زریان هەڵکردن من هەستی پێدەکەم، ئەگەر بوارێکم دەستکەوت من رووبەڕووی دەبمەوەو بەربەرکانێی دەکەم.

بەڵام کەنەدی نەیتوانی بە رووی ئەو باهۆزە بووستێت کە لە هاوینی ساڵی ١٩٦١ هەڵیکردبوو، لە رووی هۆش‌و جەستەش ئامادەیی تێدا نەبوو، کە دەرزییەکانی دکتۆر جاکۆیسۆنیشی وەردەگرت مەبەستی هەبووە.

## خوگرتن بە مادده سڕکەرەکانەوە

کۆشکی سپی دانی بەوەدا نابوو کە کەنەدی ژانەپشتی هەبووە، بۆیەش لە رۆژی ٨ ی یونیۆدا رایگەیاندبوو کەوا سەرۆك بۆ پشوودان‌و حەوانەوە دەچێتە پالم بیتش لە فلۆریدا، بەڵام باسی ئەوەیان نەکردبوو چ جۆرە چارەسەرییەکی دەدەنێ، بۆیەش سەرۆك تا رۆژی ١٢ ی مانگی یونیۆ هیچ کارێکی رەسمی نەکردووە، لە رۆژی ١٦ ی مانگی یونیۆدا سەرۆك گەڕاوەتەوە کۆشکی سپی، بەڵام بۆی نەدەکرا بەسەر

پەیژەکانـــدا ســەربکەوێت، تــا بگاتــە نــاو نووســینگە هێلکەییەکــە، ســەرۆکیان بــە بەرزکەرەوەیــەکی چــاکردنەوەی ماکینــەی فرۆکــە بەرزکردەوە.

## خورانی قوورگ

لە رۆژی ٢٠ ی یونیۆدا سەرۆك هەستیکردووە قوورگی ژان دەکات، ترافیل لە رۆژی ٢٢ی ئەو مانگەدا وتبووی رەوشی سەرۆك زۆر خراپ بوو، ئەو رۆژە لە رۆژە ناخۆشەکانی ئەو بوو لە ناو کۆشکی سپیدا، پلەی گەرمیی جەستەی زۆر بەرزدەبێتەوە، بۆ چارەسەرییش چەند دەرزی پەنسلینیان لێداوەو گەرماوێکی ساردیان بۆی کردووە.

## ژان و خەواڵوو بوون

لە مانگی ئۆگۆستی ساڵی ١٩٦١ کەنەدی هەست دەکات ژانی زۆرەو بەردەوام خەواڵوو دەبێت، بۆیە دکتۆر ترافیل دەرزی پرۆکاینی لێداوە، رۆژانــە پێــنج تــا شــەش دەرزی وەرگرتــووە، لەگــەڵ ئەوەشــدا دەرزی ئارامکردنەوەکــەی دکتــۆر جاکویسۆنیشــی وەرگرتــووە، ئــەو وتبــووی کەوایــە رۆژی ٢٨ی ئۆگۆســت لــە ماساشوشــتس دەمێنێتــەوەو بــە

ڕێکەوتیش دەگاتە سەرۆك لە شاری هایانیس، دەڵێ کە سەرۆکم بینی، هەستمکرد توورەیەو کە چارەسەرم کردووە ئارام بۆتەوە، بۆ جاری دووەمیش لە ڕۆژانی ۱۸و ۱۹ ی مانگی سپتەمبەر ئەو دەچێتەوە نیویۆرك، لە ڕۆژی ۲۵ ی سپتەمبەردا پێش ئەوەی وتارەکەی لە نەتەوە یەکگرتووەکان پێشکەش بکات کەنەدی هەست دەکات قورگی هەوی کردووە.

## حاڵەتێکی ترسناك

لە پایزی ساڵی ۱۹٦۱ ڕەوشی خراپ دەبێت، دکتۆرەکەی هێزە دەریاوانییەکە (جۆرج بیرکل) دەڵێت: زۆر ناخایەنێت سەرۆك لە پێ دەکەوێت، بۆی ناکرێت ئەو بە پێیان بڕوات و ناچاریش دەبین کورسی بۆ دابنێین، بەڵام ئەو ڕەوشەو ڕاستی هەواڵی تەندروستی سەرۆك هەمووی لە چاوی میدیاکان دەشارنەوە. هەردوو دکتۆر بیرکلی و کۆهین دوا دەرفەتیان بۆ ترافیل دانابوو، کەوا چیتر دکتۆر هانس کراوسی پسپۆڕ لە نەخۆشییەکانی پشت پشکنین چارەسەری نەکات، ئەوان خۆیان ڕاستەوخۆ لەگەڵ سەرۆك قسە دەکەن، چونکە هەردووکیان هەستیان بەوە کردبوو کەوا تەندروستی سەرۆك بەرەو شپرزەیی دەڕوات، ئەگەر بەو شێوەیە بڕوات تەنها ئەوەی بۆ دەمێنێتەوە بە دەرمانەکان بژیت و ژیانی سنووردار دەبێت.

## تەنها میدیا نەبێت

سەرەتا ترافیل ویستبووی رێگا نەدات کراوس بانگ بکرێت، ئەو وتبووی سەرۆك ناخوازێت چیتر دکتۆری تر بهێننە ناو کۆشکی سپی، ئەو قسەیەش سەرنجی میدیای راکێشابوو، رەنگە کراوس هاتبوایە ئەو لەو کارە دوور دەخرایەوە، کە لە رۆژی ١٧ ی ئوکتۆبەر کراوس لەو نزیك کراوەتەوە، پێگەی ترافیل و کارەکەی شلۆق بووەو ناوی ئەو کەمتر هاتووە. پاش ئەو ژنە دکتۆرە لە ساڵی ١٩٦١ دکتۆر بیرکلی دەبێتە ئەندامێکی تیمی چارەسەری ئەو لە کۆشکی سپی، ئەگەرچی ئەو گۆڕانە سەرەتا باس نەکرا، بەڵام ترافیل وەك ئەندامێکی تیمی تەندروستی سەرۆك دەمێنێتەوە. کە لە مانگی ئۆکتۆبەری ساڵی ١٩٦١ دەرمان و چارەسەریەکانی کەنەدی کەم دەکرێتەوە هەستدەکرێت رەوشی باشتر دەبێت، باشتر و وردتر بیردەکاتەوەو بڕیارەکانی بەئاراستەتر دەبن، دەبوایە زووتر دەرمانەکانی ئەو نەخۆشە کۆنترۆڵ بکرێت، بەرنامەی چارەسەرییەکەی سەرچاوەکانی یەك بخرێت، لە هەمان مانگدا سەرۆك کۆرسێکی چارەسەری ژانەپشت وەردەگرێت، کەواتە ساڵێك پێش قەیرانەکەی مووشەکەکانی کوبا، لەو کۆرسەدا سوودی زۆر دەبینێت.

## ماسولکە لاوازەکان

کە دکتۆرەکان چارەسەری پشتی سەرۆکیان دەکردو ئەنجامی باشی لێدەکەوتەوەو لەکاتی قەیرانی مووشەکەکاندا باش بوو، لە رۆژی ١٧ی ئوکتۆبەردا دکتۆر هانس کلاوس سەرۆک دەپشکنێت دەبینێ ماسولکەکانی پشتی سەرۆک لاوازن، ماسولکەکانی هەردوو قاچەکانیشی لاوازن.

## تارمایی ئیفلیجبوون

دکتۆرەکەی کەنەدی بە روونی بە سەرۆك دەبێژێت ئەگەر هەفتانەو بەردەوام پێنج رۆژ راهێنانی وەرزشی نەکەیت ئەوە دووچاری ئیفلیجبوون دەبیت، کە دکتۆرێکی نوێ دەگاتە ناو کۆشکی سپی، سەرۆك لەوە دەترسێت میدیاکان لە راستی نەخۆشیەکانی ئەو تێبگەن. لەو دەمانەش رێکدەکەون لەسەر ئەوەی دکتۆر کراوس بۆ سەرپەرشتیکردنی راهێنانەکانی سەرۆك بێتە کۆشکی سپی، تا هیچ چرپەو پروپاگەندەش لە کۆشکەوە دەرنەچێت، رێورەسمی زۆر وریایانە دادەنێن تا قسەکانی ناو کۆشك دەرنەچێت، ناچار دەبن گوێ لە ناخاوتنەکانی دکتۆرەکەش رابگرن، کۆشکی سپی زۆر گومان لە دەزگای ئێف بی ئای دەکات، کە بەردەوام دەیویست راستی رەوشی سەرۆك تێبگات. کراوس ٣٣ جار لە ماوەی چل هەفتەو لە نێوان رۆژی

١٧ ی ئوکتۆبـەرو ٢٤ ی یەنایـەری سـاڵی ١٩٦٢دا سـەردانی کۆشـکی سـپی کردووە، ئـەو مەسـاجی بـە پشـتی سـەرۆك کـردووەو لەبـەر رۆشـنایی‌و ئاگاداری ترافیلەوە دەرمانیشی پێداوەو حوقنەی لێداوە، بەڵام سـەرۆك حوقنەکانی پێ خۆش نـەبووەو بەباشی نـەزانیوە. مەسـاجی بـە ئـاوی گەرم‌و راهێنانـەکان دەرخسـتەی باشـی هـەبووە، بـەڵام کـە سـەرۆك لـە شـەوی جەژنـەکانی مـیلادی سـاڵی ١٩٦١ کـە لـە پـالم بیـتش بـووە ژانـی زۆری هـەبووە، دووبـارە ناکۆکیـەکانی نێـوان کـراوس‌و ترافیـل سـەر هەڵدەداتـەوە، کـە ترافیـل لـە دانیشـتنێکی دەسـتەی پزیشـکەکان ئـەوی بـانگ نـەکردووە، بۆیـەش کـراوس راسـتەوخۆ قسـەی لەگـەڵ سـەرۆك کردووە، لەوێ هەڕەشە دەکات ئەگـەر ئـەو ژنـە دکتـۆرە زۆر دەسـت لـە کاروبارەکـانی وەربـدات، ئـەو دەسـت لـەکار دەکێشـێتەوە، سـەرۆکیش رەزامەنـدی لەسـەر داواکـەی ئـەو دەکـات. کـە ترافیـل حوقنەیـەکی ئارامکردنەوە لە سەرۆك دەدات بێ رەزامەندی‌و ئاگاداری کـراوس، ئـەو یەکسەر دەگاتە سەرۆك‌و هەڕەشەی دەست لەکارکێشانەوەی لێ دەکات ئەگـەر جـارێکی تـر ترافیـل بـەبێ ئاگاداری ئـەو حوقنـەی لێ بـدات، سەرۆکیش بەڵێن دەدات ئەوە دووبارە نەکاتەوە.

## مانگە خۆشەکان

لە مانگی یەنایەری ساڵی ١٩٦٢ تەندروستی کەنەدی بەرەو چاکبوونەوە دەچوو، ئەو مانگەی ژیانی سەرۆك باشترین ماوەی ژیانی بوو، لە کۆتایی ئەو مانگەدا هەردوو دکتۆر کراوس و کۆهین وتبوویان لەوەتەی ئێمە هاتووینەتە ناو کۆشکی سپی، هەست دەکەین ژیانی کەنەدی هەرگیز وا خۆش نەبووە، لە مانگی ئەپریلیش وتبویان تەندروستی ئەو نایابە، لە مانگی مارسی ساڵی ١٩٦٢و پاش چەندین پشکنین دکتۆری ئێسك دکتۆر ویدو کراوس وتبوویان ئەنجامەکان ئیجابین. لە گەڵ هاتنی مانگی مایۆی ساڵی ١٩٦٢دا دەیانویست دکتۆر ماکس جاکویسۆن لە سەرۆك دووربخەنەوە.

لە مانگی نۆڤەمبەری ساڵی ١٩٦١دا کۆهین نامەیەك بۆ سەرۆك دەنووسێت و هوشیاری دەکاتەوە کەوا دەرزییە ئارامکەرەوەکانی دکتۆر جاکویسۆن ترسناکەو بۆ تەندروستی خراپە، بەڵام کەنەدی گوێ لەو قسانە راناگرێت، لەناو تۆماری سەردانەکانی کۆشکی سپیدا دیارە کەوا تا ئەو کاتەی لە مانگی یونیۆی ساڵی ١٩٦٢ سەردانەی جاکویسۆن رادەگیرێت، ئەو ٣٤ جار سەردانی کۆشکی سپی کردووە. جاکویسۆن دەبێژێت ئەو لە کاتی قەیرانەکەی مووشەکە کوبیەکان بەردەوام سەردانی سەرۆکی کردووە، دکتۆر کراوسیش سەرۆکی لە دەرزییەکانی جاکویسۆن ئاگادارکردۆتەوە. بەوەش دیارە کەوا سەرۆك بەردەوام رێنمایی و دەرمانەکانی جاکویسۆنی بەکارهێناوە، بەڵام بۆ کەس ئاشکرا نییە دەرمانەکان چەندن، بەڵام دەرکەوتووە کەوا سەرۆك کەنەدی بە شێوەیەك لە شێوەکان هوشیارکردنەوەکانی کراوسی بە هەند وەرگرتووە.

# بەختیاری

بەو شێوەیە سەردان‌و چارەسەریەکانی جاکویسۆن تا ساڵی ١٩٦٣ بەردەوام بوو، لە وێنەیەکدا دیارە کەوا دکتۆر جاکویسۆن لە دیار سەرۆك کەنەدی دانیشتووە کە لە فبرایەری ساڵی ١٩٦٣ لە پالم بیتش گیراوە. ئەگەرچی ئەو دکتۆرە لە رۆژی ٣ ی نۆڤمبەری ساڵی ١٩٦٣و لە یونیۆی هەمان ساڵدا سەرۆکی بینیوە، بەلاّم بەلگەیەك نییە کەوا سەرۆك دەرزی ئارامکردنەوەی لیّ درابێت، بەلاّم کە سەرۆك ژانی زۆر دژواربووە ئەو دەرزیانەی وەرگرتووە. کە لە رۆژی ١٦ی ئۆکتۆبەر قەیرانی مووشەکە کوبایەکان پەیدا دەبێت، سەرۆك بەوە بەختیار بووە کەوا ژانەپشتی باشبووەو ئامادەیی بەرگری‌و رووبەڕووبوونەوەی هەیە، بەلاّم وەنەبێت تەندروستی باش بووبێت‌و نەخۆشی تری نەبووبێت، وەك نەخۆشیەکانی میزەڵدان‌و ئەدیسۆنی هەر هەبووە، بۆیە لەو ماوەیەشدا دەرمانی ئارامبوونەوەی وەرگرتووە. لە رۆژی دەی مانگی نۆڤەمبەرەوە دەرمانی لەسەر پێشنیاری دکتۆرەکان لە کاتی پێویست وەرگرتووە، بەلاّم کە حەساسیەی زۆرتربووە دەرمانەکانی گۆڕیوە، جا ئەو دەرمانانە لەلایەن دکتۆر جاکویسۆنەوە بووە یان دکتۆرەکانی ترەوە. لە کاتی قەیرانی مووشەکەکان ردوشی لە کاتی بەستنی کۆنگرەکە لەگەڵ خرۆشۆف باشتر بوو، دیارە کەوا تەندروستی وەك کاتی پەلاماردانەکەی دورگەی بەرازەکان نەبووە، کە بڕیاری سەرکەش‌و خێراو توندی زۆری دەرکردووە.

ئەگەر سەرکەشی کەنەدی لە کاروبارە سیاسیەکانیشی دووربخەینەوە، ئەوە لە رۆژانەو کارە تایبەتیەکانی دوور ناخرێتەوە،

بە تایبەتی لە وەرگرتنی حەبی هەوەس بۆ پەیوەندییە سێکسییەکانی، دیارە کەوا ئەو رەوشت و هەڵسوکەوتی سەرۆکە ئەمریکییەکان و هەتا درۆکردنیش لەو رووەوە زۆر باندۆری لەسەر کەسایەتی سەرۆکی ئەمریکی نەبووە، وەك چۆن لە کۆتایی نەوەدەکان سەرۆکی ئەمریکی بیل کلینتۆن لە پێش کۆنگریس کردبووی.

ناکرێ پەیوەندییەکانی کەنەدی بە ژنانەوە پشتگوێ بخرێت، بەتایبەتی لەگەڵ (مارلین مۆنرو) و (جودیت کامبڵ)، کە دەزانرا ئەویان هاورێ و دۆستی سەرکردەی مافیا (سام گیانکانا) یش بووە، ئەوەش بە هەڵەیەکی سیاسی کوشندەش دەزانرێت.

کە ئیدارەی کەنەدی کۆششی دەکرد تاوانی ئەو رێکخراوە بنەبڕ بکات، بەڕێوەبەری دەزگای ئێف بی ئای (ئادگار هۆڤەر) سەرۆکی لەسەر پەیوەندی لەگەڵ کامبڵ ئاگادار دەکاتەوە، بەڵام ئەو پەیوەندییەکەی بەو ژنەوە تا مانگی ئۆگستی ساڵی ١٩٦٢ نابڕێت.

لە مانگی یولیۆی ساڵی ١٩٦٣ بەڕێوەبەرایەتی دەزگای ئێف بی ئای سەرۆك ئاگادار دەکاتەوە لەو ژنە دوور بکەوێتەوە کە ناوی (ئالین رومستیش) بوو، چونکە ئەو لە ئەڵمانیای خۆرهەڵات گەورەبووە، بۆیە گومانی جاسووسی لەو ژنە دەکرا. بەڵام ئەو ژنە چەند جارێك هاتۆتە ناو کۆشکی سپی و لە چەندین ئاهەنگی رووتبوونەوەش بەشداربووە و لەگەڵ کەنەدی سێکسیشی کردووە. کەنەدی ئەو ژنەی بە هۆی کەسێکەوە ناسیبوو کە بەردەوام ژنی بۆ ئەندامانی کۆنگرێس بۆ کاری سێکسی هێناوە، کە ناوی (بوبی بیکر) بووە. ئەگەرچی پەیوەندی کەنەدی بەو ژنانەوە کاریگەری لەسەر کەسایەتی خۆی هەبوو، لەسەر

ئاسایشی نەتەوەیی ئەمریکی باندۆری خراپو ترسناکیشی هەبوو. هۆڤەر لەلای رۆبرت کەنەدی برای سەرۆك لەسەر پەیوەندییەکانی سەرۆك بە ژنانەوە گلەیی‌و قسەی کردبوو کەوا پەیوەندییەکانی ئەو لەگەڵ رومسیتش بووە، بۆیەش هەموولایەك کار بۆ ئەوە دەکەن، ئەو ژنە لە ۲۱ی ئۆگۆست بۆ ئەڵمانیای خۆرئاوا دووربخرێتەوە.

ژنەکەش وتبووی من نە جاسووسم‌و نە سەردانی کۆشکی سپیشم کردووە، ئەو درۆیەش بۆ ئەوە کراوە تا سەرۆك کەنەدی لە پۆستەکەی بمێنێتەوە. پرسیاریش ئەوەیە ئایا بەکارهێنانی زۆری دەرمانەکان رۆڵی هەبووە کەوا کەسایەتی ئەو پیاوە بەرەو ژنان ببات، لەو بوارەدا سەرکێشی بکات، وەڵامەکەش رەنگە لە هەموو شتەکان تێکەڵ بێ.

لوتبەرزیو نەزانین جۆرج بۆشیان بەرەو گیانبازی دەبرد تا کێشەو قەیرانی زۆر گەورە لەو جیهانەدا بنێتەوە، کە ناکرێ ڕووبەڕوویان بووەستینەوە. (ستیڤن گروبارد)

تۆنی بلێر لە پەیکەرێك دەچێت، نیوەی یولیوس قەیسەرەو نیوەکەی تری بەڕێز مەسیحە، بلێریش وەك لوید جۆرجو مارگرێت تاتشەری سیاسیەکانی پیش خۆی تێگەیشتبوو کەوا ڕۆڵی ناپلیۆن بگێڕێت هیچ سوودی نییە. (لۆرد مورگان)

## بلێرو بۆش

ئەو شەڕەی هەردوو سەرۆکی ئەمریکی جۆرج بۆشو سەرۆك وەزیرانی بریتانی هەڵیانگیرساندو شێوازی مامەڵەکردنیان لەگەڵ ڕەوشەکە، هێمای لوتبەرزییان دەگەیەنێت. ئەو زانیاریانەی لەو مەسەلانەی بۆ هاووڵاتیان ئاشکرا کراوەو زانراوە هەموو وردەکاری بڕیارەکانی تێدا نییە، کە لەوێ چۆن ئەوان مامەڵەیان کردووە، بەتایبەتی هەڵسوکەوتی تایبەتی بلێر لەنێوان ساڵانی ١٩٩٨ تا ٢٠٠٣.

# هەڵوێستو دژە هەڵوێستەکان

ئەگەرچی شەڕەکەی عێراق بە پلەی یەکەم بڕیارێکی ئەمریکی بوو، وەنەبێ لە سەر ئەو پێشهاتە بۆچوونەکانی بلێر وەرنەگیرابێت، چونکە ئەو لە مانگی مایۆی ساڵی ١٩٩٧ەوە دەسەڵاتداربووە، واتە سێ ساڵ پێش سەرۆك بۆش. کە بلێر سەرۆکی ئۆپۆزسیۆن بوو لە رۆژی ١٥ی یولیۆی ساڵی ١٩٩٦ لەگەڵ ئەودا یەکەمین دەمەتەقێی زۆر گەرمیان بە یەکەوە لە ماڵەکەی ئەودا بووە، بە یەکەوە قسەمان لە سەر مەسەلە هەنووکەییەکانی بەردەم حیزبی کرێکارانی نوێی بریتانی بوو. یەکەم دانوستانمان لەسەر عێراق لە رۆژی ١٥ی یۆلیۆی ساڵی ١٩٩٨ لە داونینگ ستریت بوو، لەو دیمانەیەدا کتێبەکەی نووسەر (جوناپان راندال) م پێشکەشکرد، کە لەسەر ژانو چەرمەسەری کوردەکان بە ناوی (تراژیدیای کوردان) نووسیبووی، نووسەرەکەی ژوورنالیستە لە رۆژنامەی واشنتۆن پۆست، ئەو یەکێك بوو لەوانەی لەگەڵ رووخانی رژێمی سەدام حوسێن بوو. من ئەو هەڵوێستەی خۆم لە نامەیەکدا بۆ بلێر دەربڕیبوو لە رۆژی ١٢ی نۆڤەمبەر بۆم رەوانەکردبوو، ئەو لە وەڵامدا بۆی نووسیبووم:

ئێمە کۆشش بۆ رووخانی رژێمی سەدام دەکەین، ئیشی ئێمەش نییە پاشان کێ حوکمی عێراق دەکات، ئەگەرچی ئێمە ئەوە بە باش دەزانین حکومەتێکی تر حوکمی عێراق بکات.

## تاقیکردنهوهیهکی دمولی

ئهگهر ماوهیهکی کهمێکیش بووبێت ئهوا شهڕهکهی کۆسۆفۆ باندۆری لهسهر بلێر، لهسهر ئاستی خۆههڵدانو بڕوا بهخۆبوونو مەزنبوونی ههستهکانی (من)و دهسهڵاتی تاکه کهسی لهسهر بڕیارهکان ههبوو، ئهوهش نیشانهی ههژمزوونی بلێره لهسهر سیاسهتهکانی دهرهوهدا، کۆسۆفۆ یهکهم تاقیکردنهوهی دمولی بوو بۆ بلێر، لهوێوه نیشانهکانی لوتبهرزی تێدا دیاردهکهوێت، ئهوهش له ئاکارهکانی به چاو دهبینرا. که سهردانی ئوردوگای پهنابهرانی کردبوو وهك پاڵهوانێك پێشوازی کرابوو، بۆیهش کلینتۆن رۆژێکیان به بلێری وتبوو، واز بێنهو چیتر ئهو نمایشانه مهکه.

بلێر زۆر شانازی باوهڕ بهخۆبوون له ههڵسوکهوتهکانی دهردهکهوت، بۆیهش یاریدهدهرهکانی کلینتۆن گاڵتهیان پێ دههات، که کۆششی دهکرد لاسایی رهوشتو ههڵسوکهوتو قسهو کارهکانی تشرشڵی دهکردهوه. بلێر شۆخی بهوه دههات که له دهسهڵاتدا شێوازی تاتشهری پێوه دیاره، بهڵام ئهوهیان راست نهبوو، چونکه لهوهیاندا ههڵهبوو چونکه ئهو له ههموو لایهکهوه ههر له بوونی فهلسهفهیهکی سیاسیو ههبوونی ئهزموون له پێش وهرگرتنی پۆستهکهو بایهخدان به وردهکارییهکان هیچی لهو نهدهکرد، چونکه بلێر پێش وهرگرتنی ئهو پۆسته له ههموو سهرۆکهکانی تری بریتانی له پاش رامزی ماکدوناڵد له ساڵی ١٩٢٤ بێ ئهزموون تربوو، کهمی ئهزموونهکهشی بوو تۆمارهکانی تۆنی بلێری رووخاندبوو.

## دەسەڵاتی بەرپرس یان دەسەڵاتی دەزگاکان...؟!

تاتشەر بە بەهێزکردنی دەزگاکان و وەزیرەکانی دەسەڵاتەکەی بەهێز کردبوو، بەڵام بلێر دەسەڵاتەکەی لەسەر حیسابی وەزیرەکان بوو، سکرتێرەکەی (ئەلیستر کامیل) لە هەر یەك لە وەزیرەکانی حکومەتەکەی دەسەڵاتدارتر بوو، بلێر دەسەڵاتی حکومەتە گشتکارەکەی لاواز کردبوو، لە ئاهەنگی دووەم بردنەوەی دەسەڵات و بە بێ ئاگاداری پەرلەمان حکومەتەکەی لە ناو بازنەی دەرەوەو بەرگری چڕ دەکاتەوە، ئەو سیاسەتەش لە رۆژانی شەڕی یەکەمی جیهان رەنگی داوەتەوە، کە دوور لە لێکۆڵینەوەیەکی بابەتیانە باوی نامێنێت. ئەوەش بە هیچ شێوەیەك دادوەری تێدا نییەو جۆرێکە لە لوتبەرزی، بەرپرسی یەکەمیش لەوەدا بۆ سیاسەتەکەی بلێر دەگەڕێتەوە.

## جۆرج بۆش

جۆرج بۆشی کوڕ لە یەنایەری ساڵی ٢٠٠١ بەبێ ئەوەی زووتر هیچ دەسەڵاتی هەبووبێت باڵاترین دەسەڵاتی حوکمی لەسەر ئاستی نەتەوەیی وەردەگرێت، راستە ئەو زووتر حاکمی ویلایەتی تکساس بووە، بەڵام حاکمی ئەو ویلایەتە تەنها دەسەڵاتی تەنفیزی هەیە، کە دەسەڵاتەکەش لە هەموو دەسەڵاتەکانی تری ویلایەتەکانی تری ئەمریکی کەمترە. کە بۆش دەسەڵاتەکە وەردەگرێت بەڵێن دەدات دەسەڵاتەکان بداتە دەست کەسانی لێزان و کارامەو بۆ دەزگاکانی

داراییش لەسەر بنچینەی ئەنجامەکان حیساب بکات. ئەوەشیان دووره لە لوتبەرزی، بەڵێنی دابوو سیاسەتی دەرەوە لەسەر ئاستی هەموو جیهان بەهێز بکات، بەهێز، بەڵام بەرێز. بەڵام لە رۆژی ١٦ی مانگی فبرایەری ساڵی ٢٠٠١ رەزامەندی دەربڕیوە هاوکار لەگەڵ بریتانیا سەنتەرێکی رادارو سەرکردایەتی هێزەکانی عێراقی بۆردومان بکات، هەر لە رۆژی ١٠ی ئۆگۆست چەندین مۆڵگەی سەربازی عێراقی بۆردومان کردووە.

ئەوەش مێژوو بڕیار دەدات ئەگەر ئەمریکا لە بن دەسەڵاتی بۆش لەسەر ئاستی دەرەوەدا بەرێزبووە، بەڵام بۆ هیچ سەرۆکێکیش پاش هێرشەکەی یازدەی سێپتەمبەر ئاسان نەبووە ئەوە نەکات، بۆش خۆی وەك Decider (بڕیاردەر) ێك لێکردبوو، پاشان ئەو دەبێتە (سەرۆکی کاتی شەڕەکە). لەو پێشهاتەدا ئەو وای دەزانی کاری یەکەمی ئەو ئەوەیە هەڤاڵبەندییەك پەیدا بکات بۆ هێرشێکی سەربازی، بۆیە شەڕ دژی تیرۆرەکەی زۆر وردبینیانە نەبوو، بەڵکو مەبەستی هەبوو، بەڵام ئەوەی باس دەکرا کەوا شەڕەکە دژ بە رێکخستنەکانی رێکخراوی (القاعدە) یە. گرفتەکەش ئەوەبوو کەوا رەوشتی (من) لە ناو خودی سەرۆك گەورە دەبوو، بۆیەش بەڵێن دەدات، ئەوان (بنبڕ بکات)و (وایان لێدەکات لە ترسانا رابکەن)و هەروەها بەڵێنی دابوو (جیهان لەو بەدکارانە پاك بکاتەوە)، ئەوانەش نەك تەنها قسەی سەر زارەکی بوون و بەس، بەڵکو کارەکان بەپێچەوانەی رێبازەکە دەکەوتەوە، شەڕەکە بووە شەڕێکی چەکداری وەك شەڕەکانی یەکەم و دووەمی جیهان.

## بەرەو پێشچوونی لوتبەرزییەکان لەلایەن بۆش و بلێرەوە

کە رێکخراوێکی تیرۆریستی توانی لە دوو شاری گەورەی ئەمریکی زەبری کوشندەو خوێناوی بووەشێنێت، بۆش و بلێر ناچاربوون بانگهێشتی ئەوە بکەن کەوا لە مێژوودا رووبەڕووبوونەوەی وا ترسناك نەبوونەتەوەو ئاسایشی جیهان لە مەترسیدایە، بۆیەش هەموو لێدوانەکانی پاش پەلامارەکەی یازدەی سێپتەمبەر بۆنی توندیی و تووڕەییان پێوەبوو. داگیرکردنی ئەفغانستان بیانووی گونجاوی هەبوو، بەلاّم لوتبەرزی بۆش و بلێر پەیدابوونی نیگەرانییەك بوو بۆ سەرهەلّدانی هەلّمەتێکی سەربازی لە ئەفغانستان. زۆر ئامۆژگاری بلێرو بۆش کرا، کەوا شەڕکردنی تیرۆر بەو شێوەیە نابێت، بەتایبەتی مامەلّەکردنی گیراوەکان، ئەوانە هەموو قەیرانەکەیان ئالۆزتر دەکرد، ئەوانەش بە جۆرێك لە جۆرەکان دیاردەی لوتبەرزییەکەیانی دەگەیاند.

## هێمای مەترسییەکان

یەکێك لە مەترسییەکان ئەوە بوو کە سەرۆك بلێر لوتبەرزی بیگرێت، چونکە ئەو وتارەی لە کۆنگرەی حیزبی کرێکاران لە پاش پەلاماردانەکەی یازدەی سێپتەمبەر پیشکەشی کردبوو، لەوێدا بەلێنی بە گەلی ئەمریکی دابوو، کەوا ئێمە لە سەرەتاوە لەگەلّتان بووین، بەردەوامیش لەگەلّتان دەبین. کە ئەو زۆرتر هاوکاریی لە

یاریدەدەرەکانی دەخواست، بۆیەش بڕیارەکانی دووربوون لە لایەنی بابەتیانەو لێپرسینەوەو دەستەبەندی، ئەوەش حیساباتەکانی بلێری بەرەو هەڵەکاری و وەرنەگرتن و هەرس نەکردنی ئەنجامەکانی داگیرکردنی ئەفغانستان و عێراق لێکەوتەوە. لە مێژوودا زۆر سەرکردە هەبووە لە کارنامەی خۆیدا شکستی خواردووە، بەڵام شکستەکەی بلێر شێوازێکی تر بوو، وەك شکستەکەی بۆش، کە رێك سێ ئاکاری پێوە بووە، وەك زۆر بڕوابوون بە کەسایەتی خۆی، نیگەران و دوودڵی بەردەوام، بایەخ نەدانیش بە باسکردنی وردەکارییەکان. بڕوابوونی زۆری سەرکردە بە خودی خۆی، ئەوەش وا دەکات بڕیارەکانی بە تەنها دەربکات، بۆیەش گوێ لە ئامۆژگارییەکانیش ناگرێت.

## گرنگیدانی زۆر بە راگەیاندن

بلێرو بۆش زۆر شانازییان بە سیاسەتی خۆیانەوە دەکرد، بەرنامەیان لەسەر بەرجەستەکردنی (وێنە گەورەکە) بوو، ئەوان نەك تەنها لە بازنەی ئەفغانستان و عێراق بەڵکو لەسەر ئاستی هەموو جیهان نیگاکانیان لە بینینێکی نوێ و بنەماکانی بنچینەیی ترەوە رووماڵ کردبوو. ئەو دوو سەرۆکە چەندین ساڵ وتارە سیاسییەکانیان دژ بە دوژمنەکانیان پەرە پێ دەداو بەردەوام حکومەتی بریتانی دەستەواژەی شەڕی دژە تیرۆری تا ئەپریلی ساڵی ٢٠٠٧ دەوتەوە. هەردوو حاکمەکە بایەخیان بە وردەکارییەکانی مەسەلەکان نەدەداو رێزی راستییەکانیان نەدەگرت، بایەخی سیاسی بلێریش ئەوەبوو

بــرِواو مەبەســتەکانی بۆشــی پــاش شــەڕەکەی ئەفغانســتان پــەیرەو کـــردووەو ســـازکاربووە بـــۆ شـــەری دژ بـــە عێـــراق، ئـــەو دووانـــە پەیوەندییـەکی شـێتانەیان لەنێوانـدا هـەبووە، بـەوەش یـەکتریان تونـد دەبەستایەوە.

## چەقی رووداوەکە

یەکێك لە سیماکانی لوتبەرزی بلێر ئەوەبوو، ئەو بە لێدوانـەکانی بەردەوام خـۆی دەخستە چـەقی رووداوەکـان، ئـەو پـەیامێکی لـە سـاڵی ٢٠٠٠ پێشـکەش کردبـوو کـە تێـدا ئاراسـتەی دەسـتەی کارمەنـدەکانی کردبوو، ئـەو چـەند برگانـەی لـە وتارەکەیـدا زانرابـوو هانیـان دەدات، کۆشش بکەن تا سەرنجڕاکێش و باڵکێش بن، ئێوە بەردەوام پەیوەنـدیم پێـوە بکـەن، ئەگـەر یارمـەتی و رێنماییتـان گـەرەك بـوو، نووسـەری بیرەوەریـەکانی سـەرۆك وەزیرانـی پێشـووتر (رامـس ماکدوناڵد) بـەو شێوەیە باس لە بلێر دەکات:

کێشـەی سـەرەکی بلێـر لەوەدایـە کـەوا کەوتۆتـە نـاو گێـژاوە کولتوورییەکـەوە، کـە لـەو رۆژانـە بۆتـە کولتـوورێکی میللی ناشیرین. رەنگـە (نمایشـکردن) یـش دیـارترین رووکـار بێـت، ئـەو ئـارەزووی بریقەداری زۆرەو حەزیش دەکات زوو زوو بلێـت، بریتانیـای نوێمـان و حیزبـی کرێکـاری نـوێ و وڵاتـە گەشـاوەکەمان، هـەروەها رێزنـەگرتنی حیکمەت و زانایی پسپۆڕەکان، ئەوانەش هەموو سیمای لوتبـەرزییەکەی بلێرە.

## جیاوازییەکان

پاش پەلامارە تیرۆریستییەکەی یازدەی سێپتەمبەر بوار بۆ بلێر ساز دەبێت بەرنامەڕێژی بکات بۆ پیادەکردنی بەرنامەکانی، ٥٤ دیمانەی لەگەڵ سەرکردە بێگانەکان هەبووە، ماوەی ٦٠ هەزار کیلۆمەتر فڕیوەو ٣١ گەشتی لە سەرانسەری جیهاندا کردووە، بەڵام لەوماوەیەدا بۆش ئارامتربووە زۆرتر خۆی راگرتووەو ماوەیەکی باشیشی بۆ نووستن داناوە، لە لێدوانەکانیدا ئارامتر و نەرمتربووە.

بلێر بۆ ئەوەی خۆی وا دەربخات کەوا کەسێکی زۆر کاریگەرەو رۆڵی دیاری لە شەڕەکەی ئەفغانستاندا هەیە، لە سەرەتای مانگی یەنایەری ساڵی ٢٠٠٢ داو هەشت هەفتە لە پاش شکستی تاڵیبانەکان بە زەبری هێزەکانی هەڤاڵبەندی باکوور دەگاتە کابوڵ. بە درێژایی ساڵی ٢٠٠٢و چەند مانگێك بەرنامەی وا بووەو بڕیاری داوە لە ناو چەقی رووداوەکان بێت، ئەوەشی بۆ میدیای بریتانی دەرخستووەو ئەوانیش رووماڵێکی بەرچاویان بۆ کردووە، رای گشتی ئەمریکیش ئەو رەوشت و نمایشانەی ئەویان بە ئاسان و لێزان وەسفکردووە، بۆیەش بۆ سەرۆك بۆش گرنگ بوو لە مەسەلەکەی عێراقیش رۆڵی بلێر وا بەرجەستە بکات. لە کۆنگرەی هەشت وڵاتە پیشەسازییەکە، کە لە شاری پترس بۆرگ لە ساڵی ٢٠٠٦ بەسترابوو بلێر و بۆش بەیەکەوە بوون، بەبێ ئەوەی ئاگاداربن مایکرۆفۆنەکەیان بەستراون بەیەکەوەو لەسەرخۆ قسە دەکەن، لە قسەکانیاندا دەردەکەوێت کەوا بلێر زۆر گوێڕایەڵی بۆشەو فەرمانەکانی ئەوی قبووڵە، ئەوەش بێگومان بە سوکایەتی بۆ پۆستی سەرۆك وەزیرانی بریتانی دەگەڕێتەوە.

پاش پەلاماردانەکەی ئەفغانستان بۆش بیری لەوە کردۆتەوە رژێمی سەدام بڕوخێنێت، بۆیەش لە رۆژی ۲۱ ی نۆڤەمبەری ساڵی ۲۰۰۱ بۆش داوا لە وەزیری بەرگرییەکەی دۆناڵد رامسفیلد دەکات هاوکار لەگەڵ سەرۆکی دەستەی ئەرکانی هاوبەش تۆمی فرانکس بەرنامەڕێژی بکەن. ئیدارەی بۆش کار دەکات رژێمی عێراق بە رێکخراوی القاعدە ببەستێتەوەو رووی ئەمریکاش وا دەردەخات کەوا حکومەتێکە هەموو کارێکی لە دەست دێ، کۆشش دەکات لەگەڵ یاسای نێودەوڵەتی مامەڵە بکات، بۆش‌و تشینی‌و رامسفیلد بەو رێبازەوە کەوتوونەتە بەرنامەڕێژی.

جۆرج بۆش دوو هاوڕێی خاوەن ئەزموونی لەگەڵدابوو، هەردووکیان لەسەردەمی باوکیدا کە سەدام حوسێن کوێتی داگیر کردبوو، ئەوان وەزیربوون، کۆڵن پاوڵو دیك تشینی، ئەو دوو وەزیرە یارمەتی زۆری بۆشیان دەدا. سەدام کە کوێتی گرت، مەبەستی سەرەکی ئەوەبوو قەرزەکانی کوێتی کە دەگەیشتە ۳۰ ملیار دۆلار لە کۆڵ خۆی بکاتەوە، ئەو لە جیاتی ئەوەی کێلگە نەوتییەکەی رومێلە داگیر بکات، هەموو وڵاتەکەی داگیرکرد، بەوەش نەوەستا هەڕەشەی لە خوارەوەش دەکردو ترسی دژواریش گەیشتە مەملەکەتی عەرەبی سعودییە. لە سەرەتاداو لە کۆبونەوەی دووەمی ئەنجومەنی ئاسایشی نیشتیمانی لە رۆژی ۲ ی ئۆگستی ساڵی ۱۹۹۰ لەگەڵ سەرۆکدا باس لە رەوشی تایبەتی سەدام کرابوو، ئەودەمانە پاوڵ پۆستی سەرۆکی هەیئەی ئەرکانی هێزە هاوبەشەکانی هەبوو، لەوێ پرسیبووی:

لەو شەڕەدا رۆڵی تایبەتی سەدام حوسێن وەك تاکێك چ دەبێت...؟ ئەگەر سەدام نەما، کەس هەیە ببێتە بەدیلی ئەو.

وەلاَمی ئەو پرسیارە لەلایەن (برنست سکوکروفت)ی راوێژکاری ئاسایشی نەتەوەییەوە دەدرێتەوەو دەڵێت:

وڵاتی عێراق پارچە پارچە دەبێت.

راوێژکاری سیاسی دەرەوە (ریتشارد هاس) وتبووی:

من بڕوا ناکەم کەس لە خۆپەرستیدا بگاتە سەدام.

تا سەرۆك دەستی بە سەر هەموویاندا بشکێت، دانوستانەکان لەو پێشهاتەدا بەردەوام‌و کراوەبوو، ئەوەش دەستپێکی هەڵمەتەکەی گەردەلوولی بیابان بوو لە ساڵی ۱۹۹۱دا، واتە وەدەرهێنانی هێزەکانی عێراقی لە کوێت، بە بێ ئەوەی پایتەختەکەی عێراق داگیربکەن.

## هەنگاوێکی هەڵە

جـۆرج بۆشـی بـاوك هێزێکـی فـرە رەگـەزی لـە چـەندین وڵات پێکـەوەنابوو، هێزەکـە بـە ژمـارەو بـە چـەك فـرە مـەزن بـوو، بەشـی گەورەو دیاری هێزە بەشداربووەکەش بریتانیـاو فەرەنسـاو سعوودیەو میسر بوون. ماوەی شەش هەفتەی بەردەوام لـە ئاسمانـەوە بۆردومـانی هێـزە عێراقییـەکانیان لـە کوێـت کردبـوو، ئـەوەش بـوو سـەرکەوتنی سەربازی مەیسەرکردبوو، پاش ئەو بۆردومانە لە رۆژی ٢٤ی فێبرایەردا هێرشـێکی فراوانیـان بـە تـانکی زۆر نـوێو پێشـکەوتوو بـە فرۆکـەی هیلیکۆپتەری گەورە کردبوو، بە رازیبوونی هەر یەك لە پاوڵو تشینی شـەڕەکە راگـیرا، بـەڵام ئـەو شـەڕ وەسـتانە بـە بۆچـوونی تشـینی هـەنگاوێکی هەڵـەبوو، ئـەو وتبـووی دەبووایـە هـەر لـەو هێرشـەدا سـەدامیش بـڕوخێنین. لەبـەر رۆشـنایی ئـەو بۆچـوونەدا مەسـەلەی رووخانی سەدام پاش دوازدە ساڵ باسکراوە، بۆیەش دەبوایە ئەوەیان لە ناو هزری جۆرج بۆشی کوڕی هەبووایـە، چونکە رەنگـە ئـەوان بیریـان لەوە کردبێتەوە ئەگـەر سـەدام بـڕوخێنن، ئەگـەری ئـەوە هەیـە چـەند کێشەی گچکەیان بێتـە پـێش، بۆیـەش بـۆش و بلێـر مەسـەلەکەیان بـە سادەیی و بـە ئاسـان وەرگرتبـوو، وەك چـۆن ژەنـراڵ (تـۆمی فـرانکس) وتبووی:

مـن دەزانم ئـەو سـەرهەڵدانەی پـاش شـەڕەکەی کوێـت بـەرپابوو، بەرنامـەو پلانـی سـەدام حوسـێن خـۆی بـووە، ئەوەشـیان بـە دروسـتی وەرگرتبوو.

# ئەو ڕێگایانەی بۆش هەڵیبژاردن

یەكێك لەو ڕێگایانەی لە پاش ساڵی ٢٠٠٢ لە پێش جۆرج بۆشدا بوو، كەوا پاش داگیركردنی بەغدا ڕێكەوتنێكی سیاسی بكاتو دەسەڵاتەكە رادەستی عێراقییەكان بكاتەوە، بەوەش هێزەكانی ئەمریكی بەپەلە لە عێراق بكشێنەوە، یان پرۆسەی داگیركردن پەیڕەو بكەن، بەرنامەی دامەزراندنەوەی دەوڵەتی عێراقیش دابڕێژن، دیارە ئەوەش هێزەكانی ئەمریكی زۆرتر لە ناو عێراق دەهێڵێتەوە تا كارو بەرنامەكە جێبەجێ دەكەن. دەبوایە هەر یەك لە بۆشو بلێر یەكێك لەو ڕێگایانە هەڵبژێرن، لەوەشدا لە ناو ڕاوێژكارەكانیدا دوو نیگا هەبوون، بۆیەش بڕیاردان لەسەر پەیڕەوكردنی كام لەو بژارانە تا دوای پرۆسەكە دواخرا، بلێر بەوەیان رازی دەبێت، پێش داگیركردنەكەی عێراقو لەبەر ڕۆشنایی كارنامەكەیان لە ئەفغانستان، تشینیو رامسفیلد لەگەڵ ئەوەدا نەبوون دەوڵەتەكە دامەزرێننەوەو خۆیان تووشی ئەو كێشە ئاڵۆزە بكەن.

باڵادەستەكان لە ناو دەستەی پارێزگارەكان لەوانە جێگری وەزیری بەرگری (پۆڵ وڵفۆفیتش)و هاوڕێیەكەی لە وەزارەتی بەرگری (دۆگلاس فایب) لەگەڵ ئەوەدا نەبوون ویلایەتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا پاش داگیركردنی عێراق ئیدارەی ئەو وڵاتە بكەن. بەرنامەكەش ئەوە بوو وڵاتەكە لە لایەن عێراقییەكانی دەرەوەو دوورخراوەكان لەوانە كۆنگرەی نیشتیمانی عێراقی ئیدارە بكرێت، بە زووترین كاتیش هێزەكانی ئەمریكی لەناو عێراق بچنە دەرەوە. لە بریتانیاش لەو دیكۆمێنتە رەسمیانەی نەخشەسازی بریتانی پاش

داگیرکردنەکە نیشانی تۆنی بلێر دراوە، دیارە کەوا ئەوو بەرپرسەکان لە زۆر بۆچوونەکان ئاگادارنەبوون. ئەوەی پەرۆشی زانینی بڕیارە هەڵەکانو جێبەجێکردنی نادروستی سیاسەتی بریتانییە، دیکۆمێنتەکان زۆر بە ئاشکرا دیاربوون کە هەموویان گەنجینەیەکن لە زانیاری زۆر بەسوود.

لە مانگی ئەپریلدا بلێر بۆ دیمانەی بۆش دەچێتە کرافۆرد لە ولایەتی تکساس، لەوێ بەیەکەوە باس لەو بەرنامەیە دەکەن لە مێشکی ئەو دایە، سەبارەت ئەو شەڕەی بەنیازن بیکەن. جاك سترۆی وەزیری دەرەوە لە رۆژی ٢٥ ی مارسدا وتبووی:

دەبێ ئێمەش وەڵامی ئەو پرسیارە سەبارەت بەو مەسەلەیە بدەینەوە...؟ دیارە لەومیاندا لارییەکی گەورە هەیە. زۆربەی ئەو شرۆڤانەی لە ئەمریکاوە دەگەیشتن، لەگەڵ ئەوەدا بوون کەوا رژێمەکە بە بیانووی چەکە کۆمەڵکوژیەکەوە بگۆڕن، چونکە ئەومیان هەڕەشە دەنێتەوە. بەڵام بوارو بژارەکانی گۆڕینی رژێمەکە دڵخۆشکەر نەبوون، چونکە دەبوایە ئەوە بزانن کەوا بەدیلەکەی ئەو رژێمە لەومیان باشترە.

## راپۆرتێکی رەسمی

لە رۆژی ٢١ ی یولیۆدا راپۆرتێکی رەسمی سەبارەت بە رەوشی عێراق، بە ناوی (مەرجی کارە سەربازییەکان) دەدرێتە وەزیرەکان. من لەوێدا ئاگادارم کردنەوە، کەوا بواری سازکردنی ئەگەری سیاسی بۆ پرۆسە سەربازییەکە کەم کراوەتەوە، یان ئەوەش لەخۆ ناگرێت کەوا لەودەمانەو پاشانیش بۆ دامەزراندنەوەکە چ بکرێت. کە بلێر لەگەڵ جۆرج بۆش لە کرافۆرد لە مانگی ئەپریل قسەیان کردبوو، لەوێ بلێر وتبووی:

بریتانیا پشتیوانی لە کردەوە سەربازییەکە دەکات بۆ گۆڕینی رژێمەکە، چەند مەرجێکیش هەبوو تا جێبەجێیان بکات، بۆیەش کۆشش زۆر کرابوو بۆ سازکردنی هەڤاڵبەندییەك، بۆ پەیداکردنی کەشێکی گونجاو بۆ رای گشتی پشتیوان و ئارامکردنەوەی قەیرانەکەی ئیسرائیلی فەلەستینی. چ بکرێت چەکە کۆمەڵکوژیەکان لە رێگای پشکێنەرانی چەکە کۆمەڵکوژیەکانی سەر بە نەتەوە یەکگرتووەکانەوە کە سوودیان نەمابوو دامالّن. داگیرکردنی وڵاتێکی وەك عێراق و دامەزراندنەوەکەی ماوەیەکی زۆری دەویست، زۆریش گران لە سەریان دەکەوت، ئەوەش زوو زانرا کەوا بەرنامە جەنگییەکانی ئەمریکی لەو خاڵەدا بێدەنگ بوون.

## ڕووداوە جۆراوجۆرەکان

پاش تێپەڕبوونی دوو ڕۆژ بلێر ئاگادار کراوەتەوە کەوا زانیارییە هەواڵگریەکانی واشنتۆن جیاوازییان تێدایە، پاش ئاگادارکردنەوەکە لە مانگی مارسدا دووبارە وەزیر سترۆ سەرۆك وەزیران هوشدار دەکاتەوە، پاش دوو ساڵ لە داگیرکردنەکەی عێراق ڕاپۆرتێك لە بەرواری ۲۳ ی یولیۆی ساڵی ۲۰۰۲ لە شەڕەکەی عێراق لە میدیاکان بڵاودەبێتەوە، لە ڕاپۆرتەکەدا نووسراوە کەوا سێ ئەندامی ئەنجومەنی وەزیران، لەوانە سەرۆك وەزیرانو وەزیری دەرەوەو وەزیری بەرگریو جێگری گشتی بەشداردەبن، کە وەزیری دارایی (گۆردون براون) ی تێدا نەبووە، تێیدا سەرۆکی مەڵبەندی زانیارییە هاوبەشەکان (جۆن سکاریت)و سەرۆکی هەواڵگری دەرەوە سێر (ریتشارد دیرلوف) باسی دانوستانەکانی واشنتۆنیان گێڕاوەتەوە. سەبارەت بە پرۆسە سەربازییەکە دیرلوف وتبووی:

ئێستا ئەوەیان وەك کارێکی حەتمی سەیر دەکرێت، بۆش بە بیانووی چەکە کۆمەڵکوژیەکانو کارە تیرۆریستەکان دەیەوێت سەدام حوسێن لەناو ببات، بەڵام ڕاپۆرتە هەواڵگریەکانو ڕاستییەکان شتەکان بە پێچەوانە نیشاندەدات، دووریشە لەو سیاسەتە، لە واشنتۆن لەسەر کردەوە سەربازییەکان کەمترین باسو دانوستان هەیە.

## گوێ پێنەدان

بە پێی ئەو زانیاریانەی بڵاوبوونەتەوە ماکینەکەی حکومەت لە پاش مانگی یۆلیۆی ساڵی ٢٠٠٧دا، ئەومیان دەزانی کە دامەزراندنی دەوڵەتی عێراقی کاتێکی زۆری دەوێت. ئەوەی شایانی باسە دەزگاکانی هەواڵگری و هێزەچەکدارەکان بێزارن لەوەی زانیاریەکانیان سەبارەت بە قۆناغی دوای شەڕەکە لە واشنتۆن کەم دەگاتە دەست.

بلێر گوێی نەدەدایە ئەو ئاگاداریانەی کە جێگرو راوێژکارەکانی پێشکەشیان دەکرد، بۆ رۆژی دوایی لەسەر خوانی ئێوارەدا، بلێر ئاماژەی بە هەبوونی کێشەو هیچ گرفتێك نەکردبوو، ئەو وتبووی:

هەموو مەسەلەکان بە باشی دەڕوات، هەموو گرفتەکان چارەسەرکراوە. ئەوەش نیشانەی بێ ئەزموونی ئەوی دەگەیاند، کەوا ئەو کەسێکی لەخۆباییەو لوتبەرزییشی پێوە بووە، وەڵام و بیانووی ئامادەشی بۆ هەموو ئەگەرو کێشەکان سازکردبوو. لەوانەی روونکردنەوەو هۆکارەکانی لە بلێر ویستبوو، ئەو لە وەڵامدا وتبووی:

تۆ (نیڤیل تشامبرلن) یت، منیش وینستۆن تشرشڵم، سەدامیش هیتلەرە. بۆیەش ئاسان نییە لەگەڵ ئەو جۆرە سەرکردەیە بەو شێوە سۆزدارییە سادەیە بیربکەیتەوەو گفتوگۆ بکەیت.

## نایەوێ گوێ لە هیچ رابگرێت

بلێـــر رەوشـــی بیرکردنـــەوەی بـــەو شـــێوە بـــوو، کـــە لەگـــەڵ راوێژکارەکانی مامەڵەی دەکرد، ئەو دڵی بە قسەکانی بۆش دەکرایەوەو هیـوای زۆر بـوو کـە هەڵمەتـە خاچپەرسـتییەکەیان بـۆ بنبڕکردنـی شـەڕخوازو خراپەکارەکانـەو جیهـان لەوانـە پـاك دەکەنـەوە. ئەوانـەی داکـۆکی لـە بڕیارەکـانی بلێـر سـەبارەت بـە شـەڕەکەی عێـراق دەکـەن، هـەموو گلەییـەکان دەخەنـە ئەسـتۆی ئەمریکییـەکان، بـەڵام ئـەومیان جێگەی بڕواکردن نەبوو، چونکە بریتانییەکان زۆرترو باشتر شارەزای ئەو وڵاتە بوون، چونکە بریتانیـا چەند ساڵێکی دوورودرێـژی سـەدەی رابردوو لە عێراق بوون، هەردوو وەزیری دەرەوەو بـەرگرییان زانیـاری زۆریان هەبووە، کە چۆن‌و بە باشـترین بـوار مامەڵە بکەن، بەتایبـەتی لـەو هەڵانـەی پاش شـەڕەکەی سـاڵی ١٩٩١ روویانـدا. بـەڵام سیاسـەتەکە خزمـەتی بلێـری نـەدەکرد. لـە وەزارەتـی دەرەوەدا لێکۆڵینەوەیـەکی ستراتیژی هەبوو، وەزارەتـی دەرەوەی ئـەمریکی کۆششـی دەکـرد چنگی بکەوێت، بەڵام بنتـاگۆن سـۆراغی نـەدەکردو گوێی لـێ نـەبوو، بۆیـەش لێکۆڵینەوەکەیان نەگەیشتە دەست. لەبەرئـەوەی بارەگـای سـەرۆکایەتی وەزیرەکـان بەرپرسـی سیاسـەتەکەی سـەبارەت عێـراق بـوو، بۆیـەش هـەموو کۆششـەکانی وەزارەتـی دەرەوە لەگـەڵ ئەمریکییـەکان هـیچ ئەنجامی نەبوو. ئەنجامەکە ئەوە بوو کە سـەرۆك بلێـر خـۆی ئیدارەی هەموو بەرنامەی سازگارییەکانی شەڕەکەی دەکرد، پرسی بە وەزارەتـی دەرەوەش نـەکردووە، بایەخیشـی بـە گلـەیی‌و تەحـەداکانی وەزارەتـی سـوپاو دەزگاکـانی هـەواڵگری نـەدەدا. لـەو رەوشـە ترسـناك‌و

چارەنووسسازە کە دەبێ دانوستان و بەرنامەڕێژی وردیش لەسەر بابەتە بنچینەییەکانیش لە نێوان سەرۆك بۆش و سەرۆك بلێر هەبوایە، بە تایبەتی باسە گەرمەکانی پاش شەڕەکەو پلانی دواتری. رامسفیلدیان لە رۆژی ٢٠ی یەنایەر راسپاردبوو بۆ پلانی پاش شەڕەکە، ئەگەرچی دەبوایە ئەو بەرنامەیە پێش ئەو بەروارەو لەسەر ئەو بابەتە لە واشنتۆن و لەندەن هاوکاری کرابوایە.

## سوپا دەشکێت

هەردوو سەرۆك لە رۆژی ٣١ ی یەنایەری ساڵی ٢٠٠٣ بەیەکەوە بۆ شرۆڤەو بەرنامەڕێژیەکە دانیشتبوون، پاشان ناوەرۆکی ئەو دیمانەیە لە رۆژنامەی نیویۆرك تایمز بڵاودەکرێتەوە، کە تێیدا راپۆرتێك بڵاوکراوەیە کە لە کۆبونەوەکەدا باس کرابوو، یەکێك لە راوێژکارانی سەرۆك وەزیران (دیڤیدماننگ) نووسیبووی:

لەوێدا ئاگاداری بلێر دەکرێتەوە کەوا بۆردومانەکە رێك لە رۆژی ١٠ ی مارسی ساڵی ٢٠٠٣دا دەکرێت.

دیارە نە بۆش و نە بلێریش نەیاندەزانی دوارۆژی وڵاتەکە بە چ دەگات، سەرۆکی ئەمریکی زووتر لە کۆبونەوەکەی کە پێشتر ئاماژەمان پێداوە، سەبارەت بە سوپای عێراق وتبووی (زوو دەڕوخێت). نووسەری کتێبی (متمانە تەواوەکە) نوسیبووی:

ئەو سیاسەتەی بڕیاربوو سوپاکە بپارێزێت، جێبەجێ نەکرا.

بەڵام نووسەرەکە نەینووسیوە ئەگەر ئەو سیاسەتە سەبارەت بە

دوارۆژی سوپای عێراق جێبەجێ نەکرا، چ روو دەدات کاردانەوەی ئەو سیاسەتە چ دەبێت. بەلام یەکێك لە سیاسەتمەدارە ناودارەکانی دەستەی پارێزگارانی ئەو دەمانە بە منی وتبوو، کەوا سوپای عێراقی هەمووی دەچێتە پال هێزە هاوپەیمانەکان، ئەوەش یاساو ئارامی پاش داگیرکردنەکە دەپارێزێت. لە کۆبوونەوە لوتکەییەکەی نێوان بۆش‌و بلێر ئەوە کۆتایی پێ هاتبوو کەوا سەرکەوتنەکە لە عێراق زۆر بەپەلەو بەیەکەوە چەند هزرو بۆچوونیان گۆڕیومتەوەو باسی حکومەتی پاش شەڕەکەیان کردبوو. لەوێدا بلێر وتبووی:

خەلکەکە زۆر سەرسام‌و نیگەران دەبن، ئەگەر ئێمە دووبارە دەسەلاتەکەی عێراق رادەستی دیکتاتۆرێکی تر بکەینەوە.

## بیانوویەکان

لەبەر ئەوەی هەردوو سەرۆکی ئەمریکی‌و سەرۆك وەزیرانی بریتانی هیچ راوێژکاریان لە وەزارەتی دەرەوەو بەرگری نەبووەو پرسیان بە کەس نەکردووە، بۆیە لوتبەرزییەکە بەردەوام بووەو لە کۆبوونەوەکەی مانگی یەنایەر بەو بەرنامەیە پلانەکەیان دارشتووە، لەو کۆبوونەوەیەدا تەنها راوێژکارە تایبەتییەکانی کۆشکی سپی‌و داونەنگ ستریتیان لەگەلدا بووەو بەس، ئەو دەستە لەزگەیەش بەردەوام چەپلەیان بۆ گەورەکانیان لێداوەو برِوایان بە سیاسەتەکانیان دووپاتکردۆتەوە. ئەو دیاردەیەش زۆر ترسناکەو ئاگادارەکان ناویان لەو دەستە راوێژکارانە ناوە، بیرکردنەوەی گردبوونەوە، شیکردنەوەی

تێ نەگەیشتنە سەربازییەکە زووتر چوار بیانووی دووبارەکراوەو زانراویان هەبووە، لەوانە بە هەدەردانی وزەو توانای مرۆیی، بڕوا بوونە تەزییەکان، نزمکردنەوەی ئاستی دوژمنو ئاگادار نەبوون لە راپۆرتە هەواڵگریەکان.

## لوتبەرزییەکەی بۆش پاش داگیرکردنەکە

لە رۆژی یەکەمی مانگی مایۆی ساڵی ٢٠٠٣ دا جۆرج بۆش بە بەرگە پەرەشووتیە جەنگییەکەی وەك ئەکتەرێکی هۆلیوْد، کە لە هیلیکۆپتەرێکەوە لەسەر فرۆکەهەلگری ئابراهام لینکۆڵن لە بەرامبەر کەناری ولایەتی کالیفۆرنیا لەسەر سەکۆی ئاهەنگی سەرکەوتنەوە دادەبەزێت، لەوێ بە ئامادەبووان دەڵێت: (نەبەردییەکە کۆتایی هات.!).

ئەو دەرچوونو دەرکەوتنە پلەیەکی بەرزی لوتبەرزی پێوە دیاربوو، ئەوەش بۆ سوپا شەرکەرەکەیان لە مەیدانەکە زێدەڕۆیی پێوە بوو ئەگەر بە مەبەستیش نەبوو بێت، هەروەها جۆرێکیش بوو لە دروشم گووتنەوەو خۆدەرهێنان.

دوناڵد رامسفیلد ویستبووی سەرۆك بۆش ئیقناع بکات لەودەمەدا ئەو دەستەواژە بەکارنەهێنێت، کە بۆش لە وتارەکەیدا وتبووی:

لە شەڕەکەماندا لە عێراق ولایەتە یەککگرتووەکانی ئەمریکاو هاوپەیمانەکانی سەرکەوتن. بەلام بلێر وەك بۆش ئاوا دوور نەرۆیشتبوون، قسەکانیان بۆنی سەرکەوتنی پێوەبوو.

# بەشی چواردەهەم

## فشارە بەهێزەکەی رەوشی عێراق بلێری دووچاری نەخۆشی دڵ کردبوو

ئـەو ئاسـتە نزمـەی پـاش داگیرکردنەکـەی عێـراق لەلایـەن ئەمریکییەکانـەوە پـەیڕەو کـرا، لـە داهـاتوودا دەبێتـە جێگـای بـاس و لێپێچینەوەی مێژوونووسان، بەوەش سەرسام دەبن. سەیرە کەوا چۆن ئەمریکییـەکان لـە بـواری سیاسـی و سـەربازی ئاسـتی ڕێکخسـتنیان ئەوەندە لاواز و کاڵفام بوون...؟

یـەکێك لـە سیماکانی لوتبـەرزییش ئەوەیـە کـەوا وەڵامـەکانیان کورتە و بایەخ بە وردەکاری بۆ بەرامبەرەکانیان نادەن، ئـەوەش زۆر لـە ڕەوشتی بۆش ڕەچاو دەکرا، وەزیری خەزێنەی پێشوو (بۆل ئونیل) کـە مـاوەی نێـوان سـاڵانی ٢٠٠٠ تـا ٢٠٠٢ وەزیـر بـووە، لـە سـەرەتاوە لەسـەر بـۆش ئـەو قسـەیەی هـەبووە، ئـەو ڕەچـاوی ئایدلۆژییـەکی نـەگۆڕی کردووە، کە باش و وردیش شـرۆڤەی نـەدەکرد. ئـەو جۆرە ئایدلۆژیانـە حیسـاب بـۆ بیرکردنـەوە ناکـات، دوا ئەگەریشـە ئـەو جـۆرە کەسـانە ڕەچاوی بکەن.

# نەهێشتنی حیزبی بەعس

پێش داگیرکردنەکەی عێراق، بۆش لەگەڵ ئەنجومەنی شەڕەکە، لە ڕۆژی ١٠ ی مارسدا قسەیان لەسەر نەهێشتنی حیزبی بەعس کردبوو، ئەگەرچی دانوستانی زۆریان کردبوو، بەڵام نەگەیشتبوونە ئەنجامێکی دیاریکراو، یەکێك لەوانەی بەشداری ئەو دانوستانە بووە وتبووی:

تێڕوانینەکە ئاشکراو ڕوون بوو، ئەوان مەبەستیان بوو لەگەڵ بەعسییەکان هاوکار بن‌و مامەڵەی لێبوردەییان لەگەڵدا بکەن. دەڵێن ئەو بەڵگەنامەی ناونرابوو نەهێشتنی بەعس، کە لەلایەن (پۆڵ برێمەر) دەرچووبوو، پرس بە کۆندۆرالیزا ڕایس‌و کۆلن پاول نەکرابوو، لە نووسینگەی دۆگلاس فایپ داڕێژرابوو، کە چارەسەری هاوسەنگ‌و چارەسەرە مامناوەندییەکەی ئەنجومەنی ئیدارەی شەڕی پشتگوێ خستبوو. یەکێك لەو هەڵانەی لە سەردەمی ڕایسی ڕاوێژکاری ئاسایشی نەتەوەیی ڕوویاندا هەڵەی مەزن بوون، کە تێیدا بڕیار دەدرێت ئەو جۆرە بەڵگەنامانە ڕاستەوخۆ لە پنتاگۆنەوە دەربچێت، بەبێ ئەوەی لە نووسینگەکەی ئەو ڕاوێژی لەسەر بکرێت. وەزیری بەرگری بریتانی (جیف هۆن) لە مانگی مایۆی ساڵی ٢٠٠٧ دا وتبووی بەرنامەو پلانی نەهێشتنی بەعس هەڵەبووە.

## مەندوبی سامی

بڕیارەکەی برێمەر لە هەڵسوکەوتدا لە سەردەمی مەندوبی سامی پاشایەتی دەچوو، ئیدارەی کاتی بڕیاری ژمارە ١٢ی پاش یازدە رۆژ لە گەیشتنیان بە بەغدا دەرکردبوو، بەپێی ئەو بڕیارە حاکمی عێراق برێمەر، هەموو هێزەکانی ئاسمانیو دەریاوانیو وەزارەتی بەرگریو دەزگاکانی هەواڵگری هەڵدەوەشێنێتەوە. بۆش و ئەنجومەنی ئیدارەی شەڕەکە لە رۆژی ١٢ی مانگی مارس رەزامەندی لەسەر بڕیاری هەڵوەشاندنەوەی سوپای کۆماری دەردەبڕن، بەڵام رازی دەبن هێزە ئاساییەکانی سوپا وەك خۆی بمێنێتەوە، دیارە کەوا برێمەر لەو کارەدا پرسی بە وەزارەتی دەرەوەو ئاژانسی موخابەراتی ئەمریکی نەکردووە، یان لەسەر بەندەکانی ئەو بڕیارە پرسی بە (رایس) یش نەکردووە، هەروەها بۆچوونی سیاسەتمەدارانی عێراقیشی وەرنەگرتبوو، دیارە کەوا راوێژکارەکانیشی ئاگادار نەبوون، ئەو باش دەیزانی بڕیارەکەی هەڵەیەکی مەزن بوو، بەڵام رازیش نەبوو بڕیارەکە هەڵوەشێنێتەوەو لە بڕگەکانی پەشیمان ببێتەوە، کە راوێژیشیان بۆ کردووە، هیچی بە هەند وەرنەگرتووە، لەو بڕیارەشدا پرسیشی بە راوێژکارو پسپۆڕە ئەمریکییەکانی ناو بەغدا نەکردووە، بۆیەش سەرۆکی نووسینگەی ئاژانسی موخابەراتی ئەمریکی لە بەغدا بە برێمەری وتووە:

بەو کارەتان، شەوانە ٣٠ تا پەنجا هەزار کۆنە بەعسی، بۆ چالاکییەکانی دژ بە ئێمە دەنێردرێتە ژێرزەمینو ناچارن کاری نهێنی دەکەن. کە دیمانەیەکمان لەگەڵ بلێر کردبوو، ئەو سەبارەت بەو دۆسیەیە وتبووی:

من وادەزانم بە کارکردن دەتوانین سوپایەکی عێراقی نوێ لە خاڵی سفرەوە دامەزرێنینەوە.

## پاش شەڕەکە

بە پێی قسەکانی کۆلۆنێل (لۆرنس ویلکرسۆن) سەرۆکی فەرمانبەرەکانی نووسینگەی کۆڵن پاوڵی پێشوو، سەبارەت بە کێشەی عێراق، بۆش بۆ دواڕۆژی عێراق لە پاش کۆتایی شەڕەکە، بایەخێکی زۆری پێ نەداوەو هیچ بەرنامەو پلانێکی وردی دانەناوە. دەسەڵاتدارەکانیشی لە وردەکارییەکانی خۆیان دوور رادەگرن، بۆش وەك بەردی شەترەنجێك بەکاری هێناون، کە بەرنامەسازییەکەش دەکات هەندێ جاریش رەوشی سەر تەختەی شەترەنجەکەش نازانێت، بەدەگمەن ئەگەرنا پرس بە پاوڵیش ناکات، بەلام هەندێ جار ئامۆژگارییەکانی تشینیو رامسفیلد بە هەند وەردەگرێت، ئەو تەنها خۆی بڕیاری لەسەر هەموو هەنگاوەکان دەدا.

## هەڵەکانی سوپا

بۆش پرسی بە کەسایەتی ژەنراڵ (تۆمی فرانکس) سەرکردەی هەرێمایەتی ئەفغانستان و عێراق کردووەو بەردەوام مامەڵەی لەگەڵدا هەبووە، ئەویش هاوولاتییەکی تەکساسییە. پەیامێنری پێشووی بنتاگۆن (تۆماس ریکس) لە رۆژنامەی وۆل ستریت ژوورناڵ و پەیامنێری بنتاگۆنی ئێستایە بۆ رۆژنامەی واشنتۆن پۆست، ئەو وتبووی، هەڵەکان رەنگدانەوەی لەسەر دامەزراوەکان هەبووەو سوپاش لە شەڕەکەی عێراق زۆر لوتبەرزی پێوەبووە. بە ئامادەبوونی هەردوو هاوسەرەکانیان، لە رۆژی ٢٤ی سێپتەمبەری ساڵی ٢٠٠٣ بۆش و برێمەر لەسەر خوانێکی ئێواراندا لە واشنتۆن بە یەکەوە دانیشتوون. کە بۆش سەیری کارنامەی ئەو دەکات، کە بە هۆی بیست راوێژکارەوە دەگەیشتنە دەستی، لەوێ بۆش وتبووی:

من دەزانم تۆ کارگێڕیت خوێندووە، منیش کارگێڕییم خوێندووە، بەلأم دیارە تۆ ژمارەیەکی زۆری راپۆرتت دەگاتە دەست.!

کە لەگەڵ بۆش بە یەکەوە برێمەر لە کلوپی سپۆرتی کۆشکی سپی پیاسەی دەکرد، لەوێ بۆش لەو دەپرسێت، ئایا رامسفیلد لە کاری رۆژانەی خۆیدا، چاودێری و سەرپەرشتی راستەوخۆی کارەکانی تۆ لە نووسینگەکە دەکات، ئاگاداری هەموو شتەکانە، برێمەر وەلأم دەداتەوەو دەڵێت، گرنگ نییە سەرۆك بۆش سەرسام دەبێت. دیارە کەوا بۆش و ژمارەیەکی کەم لە واشنتۆن دەیانزانی ئەومیان رەوشتێکی رامسفیلدەو لەو دەوەشێتەوە.

## گۆڕانی ڕێگای کاروانەکە

لە رووی سیاسییەوە بڕیار دەدەن کەوا لەبەر دژواری بەرگریو بەرهەڵستی زۆر ناتوانن خۆڕاگرن، ئەوە دەبێتە مایەی نیگەرانیو بۆچوونی چاوەڕوان نەکراو. پاش دە رۆژ لە سەرکەوتنی دووهەم جاری بۆش بۆ سەرۆکایەتی ولایەتێکی تر، رێك پاش دووەم پلان بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ رەوشی شاری فەلووجە، کۆڵن پاوڵ هەر یەك لە بۆشو بلێر لە رۆژی ١٢ی نۆڤەمبەری ساڵی ٢٠٠٤ لە کۆشکی سپی دەبینێت، لەوێ پاوڵ وتبووی:

هێزەکانمان ژمارەیان کەمەو ناتوانین کۆنترۆڵی سەرزەمینەکە بکەین. ئەو بۆچوونەی کۆڵن پاوڵ هاوسۆزی بۆچوونەکانی برێمەر دەبێت. بۆشو بلێر لەگەڵ ئەوەدا بوون رێڕەوی کاروانەکەیان بگۆڕن، بڕیارێك بدەن هێزەکانیان زۆرترو چڕتر بلاوبکەنەوە، ئەوەش پاشەڕۆژی باش نەبوو، بەلام هەردووکیان دەستەوەستان بوون، دەسەلاتیان نەبوو بۆ رووبەڕووبوونەوەی واقیعەکە. لەبەرئەوەی هەردوو سەرۆك تووشی لوتبەرزی هاتبوون، بۆیە ئاسان نەبوو بڕیارو کارنامەیان بە ئاسانی بگۆڕن، چونکە بەوە دانیان بە هەڵەکانیاندا دەناو شکستیان لەسەر دەبووە ماڵ. بلێر شانازی بەوەوە دەکرد کەوا ئەو هەنگاوە پاشەکشەی تێدا نییە. بلێر ئەو قسەیەی لە بەردەم کۆنگرەی حیزبی کرێکاران کردووە، ناکرێ بانگەشەی زۆرتر لە عەبەسییەت لەوە زۆرتر بکات. بۆش بەوە ناسراوە کەوا زۆر کەللەرەقە، گاڵتەشی بەوە دەهات هاوکارو پشتیوانی زۆر بێت، تا شەڕە ناوخۆییەکە لەناو عێراق گەرمو گەورە نەبێت، ئەو هەر بە

شانازییەوە دەستەواژەی (سەرکەوتن) ی دەوتەوە. بەڵام کە لە هەڵبژاردنە تەواوکەرەکەی ساڵی ٢٠٠٦ شکست دەخوات، رازی دەبێت ٢١ هەزار سەرباز رەوانەی بەغدا بکات، لەوەدمانەش بلێر زۆر تەنگاو کرابوو، بۆیە بە باندۆری ئەو هەژموونە پێگەکەی لە ١٠ دوانگ ستریت چۆڵ دەکات، بڕیاریش نادات هێزەکانی لە عێراق زۆرتر بکات، یان بڕیار بدات لە شاری بەسرای خواروی عێراق هێزەکانی بکێشێتەوە.

## لوتبەرزییەکەی پاش داگیرکردنەکە

سەبارەت بە بۆچوونو ئاگاداری بلێر لە رەوشی پاش داگیرکردنەکەی عێراق، ئەو بەرنامەڕێژیی نەکردبوو، ئەوەش باش لە لێدووانەکەی جۆرج بۆشەوە دەردەکەوێت کە لە پێش ئامادەبووەکانیدا لە رۆژی ١١ ی مایۆی ساڵی ٢٠٠٣ داو دە رۆژ پاش رووداوەکان وتبووی: نەبەردییەکە کۆتایی هات.

بلێر کۆنە سەفیری خۆیانی لە میسر (جۆن ساورز) بۆ کارێکی بایەخدار ناردبووە بەغدا، کە پێشتر لە بارەگای سەرۆك وەزیران کاری کردبوو، ئەو لەوێ بە نووسینی راپۆرتێك بە ناوی (عێراقو چۆنیەتی ئەو هەڵانەی کە روویاندا). لەوێ بە کورتی بەو شێوەیە باس لە تیمە ئەمریکییەکە دەکات، کە پاش داگیرکردنەکە بە سەرۆکایەتی ژەنراڵ (گای گارنر) کە کورتکراوەکەی بەو شێوەیە بوو، (لە نەبەردییەکەدا سەرکردایەتییەك نەبوو، ستراتیژییەك نەبوو، لەگەڵ یەکدا

هاوئاهەنگی نەبوو، لەگەڵ هاووڵاتییە ئاساییە عێراقییەکانیش هاوکاری نەبوو).

ئەوەی لە بۆچوونەکانی ساورز دەخوێندرێتەوە، ئەوەیە کەوا ئەوان پێویستییان بە ژمارەیەکی زۆری هێزی تر هەبووە، بۆیە پێشنیار دەکات:

بیر لەوە بکرێتەوە کەوا هێزو چالاکییە بریتانییەکان بچنە ناو شاری بەغداش، ئەگەرچی کێشەی زۆری سیاسیش لە ئارادا بوو، چونکە بڵاوبونەوەی کەتیبەیەکی ئێمە لە شەقامەکاندا باندۆری باشی دەبێت.

یەکێك لە پلەدارە سەربازییە ئەمریکییەکان ژەنراڵ (ئەلبێرت ویتلی)، کە پلەدارێکی بەرزی سوپابوو، هاوسۆزی ئەو بۆچوونەی کردبوو، ئەو لە بارەگای سەرکردایەتی ئەمریکییەکان ژەنراڵ (دیڤید ماکیرنان) کاری کردووە، مەسەلەکەش ئەوە بوو کەو پێویستە تیمی هێرشبەری ئاسمانی ١٦ لە عێراق ئاراستە بکرێت بۆ کارکردن لەناو بەغدا، کە بڕیاربوو ئەو تیمە بگەڕێتەوە وڵات. راپۆرتەکەی ساورز بۆ سەرۆك وەزیران زۆر جدی بووە، کەوا ئەوان هەزارەها سەربازیان لە بەسرا هەیەو مەترسییان لەسەرەو رەوشیان ترسناکە، چونکە ئەگەر مەترسییەکان لەسەر بەغدا بەردەوام بێتو گوشارەکە هەر هەبێت، کاریگەری لەسەر بەسراش دەبێت، بۆیە پرسیارەکەش ئەوەبوو ئایا راپۆرتەکەی ساورز چ کاریگەرییەکی لە داونںگ ستریت دانابوو...؟

(ئەنتونی سیلدۆن) دەگێڕێتەوە:

کە بلێر گوێی لەو بەرنامەیە دەبێت، بە هەموو شێوەیەك

دژایەتی دەکات، بەلاَم هیچ روونادات، لەلایەن (مایکل وۆکر) ەوە کە لە پاش ئەدمیرال سیر (مایکل بویس) کرابووە سەرۆکی هەیئەتی ئەرکان، بە توندی دژایەتی کراوە. ئەنجومەنی ئیدارەی شەڕەکە دەیتوانی چاو بە بەرنامەی بلاَوەپێکردنی هێزەکاندا بخشێنێتەوە، ئەگەر ئەوەشیان کردبوایە سەرۆك بۆش موستەحیل بوو دژایەتی بکات.

ئەوەی پرسیارەو جێگای سەرسوڕمانە بۆچی هێزەکانی بریتانی پاش داگیرکردنی عێراق و ئەفغانستان ژمارەی هێزەکانیان کەمە، ئەوەش بەپێچەوانەی کاتی هێرش و شەڕەکان بووە کە ژمارەیان زۆرتربوو، ئەوەش لە رووی سەربازییەوە بەنهێنی ماوەتەوە. مەسەلەکەش بە شێوەیەکی زۆر پەیوەندی بە میزانیەو ناستی ژمارەی هێزەکانی دوارۆژ هەیە لەو ناوچەیەداو، بەندە بە هەڵسەنگاندنی پیشەیی بۆ زانینی پێویستییەکان لەو جۆرە هەنگاو شوێنانەدا. لە مانگی دیسەمبەری ساڵی ٢٠٠٦ ژمارەی سەربازانی ئەمریکی کە لە عێراقدا لە ژێر خزمەتدا بوون دەگەیشتە ١٤١ هەزار سەرباز، هاوشانی ئەوانەش ژمارەی سەربازانی هێزە فرە رەگەزەکانیش ١٦٥٠٠ سەربازبوون، کە لە ٢٧ وڵاتەوە هاتبوون، لەوانەدا سوپاکەی بریتانی لە هەموویان زۆرتربوو، کە ژمارەکەیان ٧٢٠٠ سەربازبوو. کە لە مانگی ئۆگستی ساڵی ٢٠٠٧ ژمارەی سەربازانی ناو عێراق زیاد دەکات، ژمارەی سەربازە ئەمریکییەکان دەگاتە ١٦٠ هەزار سەرباز، ئەوەش نەدەگەیشتە ئەو ژمارەیەی کە ژەنراڵ شینسکی پێشنیاری کردبوو، کە ژمارەیان بگاتە ٢٠٠ هەزار سەرباز.

بە کۆتایی هاتنی پلانی داگیرکردنەکە ژمارەی سەربازە

بریتانییەکان لە ساڵی ٢٠٠٣ لە ٣٠ هەزار سەرباز کەم دەکرێتەوە بۆ ١٨ هەزار سەرباز، لە ماوەی تەنها یەك ساڵیشدا ژمارەکە هەر کەم دەکرێتەوە تا دەبێتە ٨٦٠٠ سەرباز، بەڵام لە کۆتایی مانگی ئۆگستی ساڵی ٢٠٠٧ دا ژمارەکە دەگاتە ٥٥٠٠ لە نێوان فرۆکەخانەو کۆشکی بەسرادا دەمێننەوەو ژمارەیان زۆر ناکرێن. لە سەردەمی بلێر ژمارەکان بەرامبەر هێزەکانی ئەمریکی کەم دەکرێتەوە، تا دەگاتە ئەو ئاستەی ژمارەکە وەك ژمارەیەکی رەمزی هاوشانی ئەمریکییەکان دەمێنێتەوە، وەك چۆن بلێر بەڵێنی دابوو.

# بەشی پازدەهەم

## بۆش و بلێر لە نەفامییەوە تووشی لوتبەرزی هاتن

## تێوەگلانێکی مەترسیدار

لە ساڵی ٢٠٠٧ بە ئاشکرا روون دەبێتەوە کەوا هێزەکان لە ئەفغانستان ژمارەیان کەمە، بۆیەش ئارامکردنەوەی ناوچەکە کاتێکی زۆری گەرەکە، هەروەها هەمان رەوشیش لە عێراق رەچاو دەکرا، ئەگەر ئارامیش دابین بکرێت، ئەوا پارێزگاریی کردن لەو ئاشتیو ئارامییەش ئاسان نییە، لە سەرەتای ساڵی ٢٠٠٦ تالیبانەکان لە خوارووی وڵات کەوتنەوە جموجۆڵو چالاکی. بریتانیا لەناو چوارچێوەی هێزەکانی ناتۆ داواکاربوو ژمارەی سەربازەکانو هێزەکانی زۆرتر بکات، حکومەتیش نەیدەویست لە مەترسییەکانی دوارۆژی ئەو کارە هاووڵاتیانی ئاگادار بکاتەوە، لەودەمانەدا وەزیری بەرگری حکومەتەکەی بلێر، (جۆن رید) ئامازەی بەوە کردبوو کەوا هێزە بریتانییەکان بە سەلامەتیو بەبێ ئەوەی یەك تەقەش بکەن، پاش سێ ساڵی تر دەگەڕێنەوە وڵات. بریتانیا مێژوویەکی دووری هەیە لە دەستێوەردان لە وڵاتی ئەفغانستان، لە گەرمەی هێزو دەسەڵاتدا هێزەکانی ئیمپراتۆریەت شکانێکی مەزنی بەسەرهاتووە. لە ساڵی ٢٠٠٦ دا لە شەڕێکی دژوارو بەدرێژایی وەرزی هاوین ، لە خوارووی ئەو وڵاتەدا شکاون، لەوەشدا دیارە کەوا هێزەکانی ناتۆ پێویستی بە هێزی زۆرتر هەبووە، بۆیەش ناتۆ لە شاری ریگا لە کۆتایی مانگی نۆڤەمبەری ساڵی ٢٠٠٦ کۆبوونەوەیەك دەبەستن، بەڵام لەوێدا ناگەنە ئەنجامێك کە هێزەکانیان زۆرتر بکەن.

## کەلێنێك ... بۆ تێکدەرو تاوانبارەکان

جیرمی گربینستۆك سەفیری پێشووی بریتانیا لە نەتەوە یەکگرتووەکان، ئەوەی لە ساڵی ۲۰۰۳ دا رەوانەی بەغدا کرابوو، سەبارەت بە بۆچوونەکانی ساورز وتبووی:

دیارە سەرەتا کەس بۆ ئارامکردنەوەی رەوشی بەغدا ئاراستە نەکرابوو، کار بۆ ئەوە نەکرابوو ئارامیو یاسا لەو شارەدا بپارێزرێت، دیارە کەوا سوپایەکی ئامادەو پۆلیسی سازکار نەبوو، تەنها سوپا سەرکەوتووە داگیرکەرەکە هەبووە. لەو رەوشە نالەبارەدا ژەنراڵێکی ئەمریکی نەبوو، کار بۆ سەقامگیری ئارامیو هێمنی بکات، کەس ئەوەی بە ئەرکی خۆی نەدەزانی، لە سەرەتاوە هەستکراوە کەلێنێك هەیەو لەو بۆشاییەدا زوو تاوانبارەکان، تێکدەرەکان، یاخیبووەکان کەوتنەخۆو زیانی زۆریان بە رەوشەکە گەیاند.

## خاڵی وەرچەرخان

لە رۆژی ۲۹ی ئۆگۆستی ساڵی ۲۰۰۳ لە ناو مزگەوتی ئیمام عەلی لە نەجەف پیرۆز دەستدرێژی کرایە سەر ئایەتوڵا باقر ئەلحەکیمو کوژرا، ئەو پیاوە سەرکردەیەکی دەسەڵاتداری میانڕەوی شیعەکان بوو، بۆیەش بلێر هیوای بەوە نەما کەوا رەوشی عێراق لە کۆتایی ئەو ساڵەدا ئارام بێتەوە، لە رۆژی ۱۹ی ئۆکتۆبەر لەبەر ئازاری دڵی، بە خێرایی بلێر دەگەیەنرێتە نەخۆشخانە. ئەوانەی لە نزیکەوە ئاگاداری

ڕەوش و بەرنامەو ژیانی تایبەتی بلێر بوون، دەیانزانی ئەو لە ساڵانی ۲۰۰۳و ۲۰۰٤ زۆر ماندوو پەریشان دەبێت، بۆیەش زۆر بڕوای بە خۆی نامێنێت. لە ئاهەنگی ساڵانەی دبلۆماسی کۆشکی باکنگهام لە ڕۆژی ٤ ی نۆڤەمبەری ساڵی ۲۰۰۳دا ماوەیەکی کورتم بۆ سازبوو، کەمێك بە یەکەوە باسی عێراق بکەین، بۆیەش ئەو سووربوو لەسەر ئەوەی لە هۆڵی ئاهەنگێڕانەکە من لە تەنیشتییەوە دانیشم، تا زۆر بە جدی باس لەو مەسەلەیە بکەین، لەبەر گەرمی باسەکە ئەو ئاگای لە کەسە دبلۆماسە بێگانەکانیش نەمابوو.

من لەگەڵ تۆنی بلێر لەسەر ئێوارە خوانێك لە مانگی یۆلیۆ بە یەکەوە بووین، لەوێ هەستم دەکرد من لەگەڵ سەرکردەیەکی دڵسۆز دانیشتووم، بەڵام لەو دیمانەیەدا هەستم دەکرد ئەو کەسایەتییەی جارانی نەماوەو کەمتر بڕوای بە خۆی ماوە. دیارە کەوا ڕووداوەکان کاریان لەو کردبوو، بە تایبەتی کە لە عێراق هیچ جۆرە چەکی کۆمەڵکوژییان نەدۆزییەوە، ئەوەیان زۆری هەژاندبوو. من لەوێ خەمم بۆی خواردو هاوسۆزیم لەگەڵیدا نیشاندا، من ویستم کەمێك ئازارەکانی سووك بکەم و دڵی خۆش بکەم، بەڵام دەترسام هەڵەیەك ڕووبدات، چونکە کە تێگەیشتم ئەو کەسێکی بێ ئەزموونە بەوەیان تووڕە ببووم، بۆیە خۆم لەو مەسەلەیە دوور ڕاگرت.

## دڵتەنگیو وازهێنان

لە ساڵی ٢٠٠٤ گەیشتمە ئەو قەناعەتەی کەوا بلێر دەسەڵاتی لە دەستداوەو میسداقیەتی نەماوە، بۆیە وا باش بوو بە زووترین کاتو نزیکترین وێستگەش دەست لەکار بکێشێتەوەو وازبهێنێت، کارێکی تر بۆ ئەو باشترو گونجاوترە. لە رۆژنامەی سەندای تایمزدا لە رۆژی ٤ ی مانگی یەنایەردا وتارێکم لە ژێر ناونیشانی (دەسەڵاتە خۆییەکەی، قەیرانی ئەلسویس بۆ بلێر بە میرات دەهێنێتەوە)، من ئێستاو ئەودەمانەش لەگەڵ روخانی دەسەڵاتی سەدام حوسێن بووم، ئەو پرۆسەیەشم بە شەرعی زانیوە، بەڵام من پێشنیارم کرد بلێر دەست لەکار بکێشێتەوەو پێش کاتی هەڵبژاردنی گشتی ساڵی ٢٠٠٥و لە پۆستی سەرۆك وەزیران دووربکەوێتەوە. بلێر نەیدەتوانی بڕوای هاووڵاتیانو پەرلەمان دووبارە وەربگرێتەوە، کە سەربازەکانی لە گۆڕەپانی جەنگدا دەکەوتن، دەبوایە ئەو بڕوایەی پێ هەبووایە. ئێمە هەموولایەك باشمان دەزانی لە پاش جەژنی پاك (فسح) ساڵی ٢٠٠٤ دا سەرۆك وەزیران، فشارێکی توندی لەسەرە، ئەوانەش هەموو لە ئەنجامی مەسەلە ناوخۆییەکانی ناو عێراق هاتنە پەیدابوون، ئەو وەك سەرۆك وەزیران لەو قەیرانەدا کەمتەرخەم بوو، ئەرکی خۆی وەك سەرۆك وەزیران رانەدەپەڕاند. هەموو رۆژنامەکان لە ئاستێکی باڵاوە بێدەنگ بوون، زۆر بە دیسپلین بوون، لەوەشدا لەسەر حەق بوون، مەسەلەکەیان وەك بابەتێکی یەك خێزانی تایبەتی وەرگرتبوو.

بلێر بەراستی لە کۆتایی مانگی مایۆو سەرەتای مانگی یونیۆی ساڵی ٢٠٠٤ دەسبەرداری پۆستەکەی دەبێت، بەڵام نازانم ئەوەیان لەبەر

ئهوهبوو کهوا له پۆستهکهیدا فهشهلی هێنابوو، یان ماندوو ببوو، یان دڵتهنگ و بێزاربوو، رهنگه ههموو ئهگهرهکانی وازهێنانهکهی ئهو لهو پۆستهدا راست بێت. ههندێ له برادهرهکانی دهڵێن دڵتهنگی و بێزارییهکانیشی رهنگدانهوهی رووداوی ههڵهکانی بوو بێت.

پاش ئهوهی جاک سترۆ هانی بلێر دهدات، لهناکاو بهبێ ئهوهی پرس به وهزیرهکانیشی بکات، پاش جهژنی پاك بریاردهدات ریفراندۆم لهسهر ریکهوتنامهی یهکێتی ئهوروپی بکرێت. چهند برادهرێکی خۆی هانی دهدهن ئیستیقاله نهدات، لهوانهی له ئهنجوومهنی وهزیران لهو نزیکبوون، بهلام وهزیری دارایی گۆردن براون حهزی دهکرد ئهو واز له پۆستهکهی بهێنێت تا شوێنهکهی ئهو بگرێتهوه، بهلام دوایی رازی دهکات دهست له کار بکێشێتهوه، چونکه بۆ ولاتهکهیان و حیزبی کرێکارانی بریتانی وا باشتره ئهو له وهرزی پاییزی داهاتوو که دهکاته پێش بهستنی سالانهی کۆنگرهی حیزب وازبهێنێت.

له مانگی ئۆکتۆبهری سالی ٢٠٠٣ بلێر کێشهی دڵی بۆ پهیدا بووه، لهگهڵ هاوسهرهکهی سهردانی دورگهی سردینایان کردووه، دووباره کێشهکهی دڵی سهری ههڵداوهتهوه، که له مالی سهرۆك وهزیرانی ئیتالی (سیلڤیو بیرلسکۆنی) ماوهتهوه. هاورێی بنهماڵهکهی بلێر لۆرد (میلفین براگ)، پاش ماوهیهك ئهو ههواله رادهگهیهنێت. ئهو هاوینه بلێر فشارێکی زۆری لهسهر بووه، له مانگی دێسهمبهری سالی ٢٠٠٤ وتبووی:

فشارهکانی ناو خێزانهکهیان و کێشه تایبهتییهکان بلێری تهنگاو کردبوو. لهو ماوهیهدا بلێر که وهك سهرۆك وهزیران له پێش

پەرلەماندا لێپرسینەوەیان لەگەڵ کردبوو، دوو جار لێدانی دڵی زۆر ببوو.

کە کاتی بەستنی کۆنگرەکەی حیزب نزیک دەبێتەوە بلێر بە هاوڕێیەکانی لە ئەنجوومەنی وەزیران سەبارەت بە وازهێنانەکەی دەبێژێت، ئەو تا کاتی هەڵبژاردنەکانی داهاتوو پێشڕەوییان دەکات، ئەوەشی لە رۆژی ۳۰ی مانگی سێپتەمبەری ساڵی ۲۰۰٤ راگەیاندبوو. بەڵام هەر لەو بۆنەیەدا وتبووی بەشداریمان لەو هەڵبژاردنەدا دوا پرۆسەی کارکردنمە، ئەوەشی وەك لێدوانێك نەوتبوو، بەڵکو ئەنجامی بیرکردنەوەو سازکردن بووە، چونکە لەو دەمانەدا لە لەندەن خانووێکی بۆ بەسەربردنی کاتی خانەنشینیەکەی کڕیبوو. ئەو لێدوانەشی بۆ وەڵامدانەوەی ئەو قسانە بوو کە لەسەر تەندروستیو نەخۆشییەکانی ئەو دەکرا. بەڵام بۆ بەیانی کە لێدانی دڵی ئاسایی نەبوو سەردانی کلینکی نەخۆشخانەیەکی کردبوو، لەوێدا دکتۆرەکان پێیان وتبوو، دڵت لاوازی لە لێدانی گوێچکەکانیدا هەیە، لەو دەمانەش ئەو لە هەموو دەمێك زۆرتر لە تەنگژەی عێراقو سیاسەتەکانی نوێ، بیرکردنەوەو کاری گەرمی ویستبوو. دووبارە بریتانیا دووچاری سەرۆك وەزیرانێك دەبێتەوە کەوا نەخۆشی هەیەو لە خەڵکەکەی دەشارێتەوە، بە ئاشکرا ئەو رەوشەی تەندروستی دەشارێتەوەو خۆی وا دەردەخات کەوا تەندروستیو فۆرمی جەستەیی زۆر سەلامەتە.

هەرچەند دەزانرا تەندروستی بلێر بەرەو باشی ناڕواتو قسەی لەسەر دەکرا، دەنگۆی ئیستیقالەکردنەکەی دەهاتەوە باسکردن. بەڵام ئەوانەی دووچاری دیاردەی لوتبەرزی دەبن، وا دەزانن کەس نییە

جێگەیان بگرێتەوەو پۆستەکەیان تەنها لەوان دەوەشێتەوە، کەواتە ناکرێ دەستبەرداریان بن. لە رۆژی ١٤ ی یولیۆو بە ئیمزای بتلەر راپۆرتێکی هەوالگری بلاودەکاتەوە، تێدا هاتبوو کەوا زانیارییە هەوالگرییەکانمان پێش داگیرکردنەکە شکستی هێنابوو. ئەگەرچی خۆی بنچینەکانی ئەو راپۆرتەی دارشتبوو، کە دەزانێت دمایشەکە هیچ گۆڕانێك دروست ناکات، تووشی شۆك دەبێت. کە وەزیرێکی کۆنی وەك لۆرد بتلر بۆ لێکۆڵینەوەکە دادەنێن، سەرۆك وەزیرانیش وەزیرێکی هاوڕێی خۆی لە لیژنەکە دادەنێت، بلێر دەزانێت کەوا رۆژەفی لێکۆڵینەوەکە بەرەو ئەوە ناچێت، داوا لەو بکەن ئیستیقالە بدات. بەلام راپۆرتەکەی بتلەر سەبارەت بە لاری لایەنی هەوالگری پێش شەڕەکە زۆر لایەن باس دەکات. بەو شێوەیە کارنامەی تۆنی بلێر هەڵدەسنگێنێت، بەتایبەتی لە نەرم نواندنی لە بڕیارە گرنگەکاندا:

کە هەستمان کردبوو سیمایەکی نارەسمیو بێ سنوور لە چالاکییەکانی حکومەتدا هەیەو مەترسییەکانیش کێشەکان ئاسان دیار دەدا، دیارە کەوا کۆی ئەحکامە سیاسییەکان، پابەندبوون بوو لەسەر لیستێك لە زانیاری، ئەوانە هەموو بێزاری کردبووین. راپۆرتەکە ورد دارێژرابوو، کاریگەریەکی زۆریشی دەبوو ئەگەر ماکینەی راگەیاندنی بلێر شوێنەوارەکانی سارد نەکردبوایەوە.

پێش وادەی هەڵبژاردنەکە بلێر ویستبووی هەڵمەتی هەڵبژاردنەکە بە تەنها بکات و رۆڵی گۆردن براون کەم بکاتەوە، بەلام ئەو سیاسەتە لەلایەن رای گشتییەوە هەرەسی هێنابوو، بەتایبەتی لەلای هەوادارانی حیزبی کرێکارانەوە، بۆیە بە پەلەو بە هێزەوە

گۆردن رۆڵی سەرەکی لە هەڵمەتی هەڵبژاردنەکە دەگریتەوە ئەستۆ، بەوەش حیزبی کریکاران هەڵبژاردنەکە دەباتەوە، بەڵام زۆرینەکەی کەمیك کەم دەکاتەوە، کە تێیدا ٣٦٪ لە کۆی دەنگەکان بەدەست دەهێنێت، بەوەش حیزبی کریکاران کە تەنها ٩،٦ ملیۆن دەنگ دەهێنن و دەسەڵات بەدەست دەهێنن، کە پیشتر لە ساڵی ٢٠٠١دا (١٠،٧) ملیۆن و لە ساڵی ١٩٩٧دا (١٣،٥) دەنگیان هەبووە، بۆیەش بەنهێنی هەستیکردبوو ئەوەیان هەرەسێکی گەورەیە بۆ حیزبەکەیان، دیارە کەوا شەڕەکەیان لە عێراق یەکێکە لە هۆکارەکانی شکستەکەیان.
سەرەڕای ئەو شکستەش بلێر خۆی دەست بە پۆستەکەیەوە دەگرێت و واز ناهێنێت، ئەگەرچی دەنگەکان، کورسیەکانیش کەم دەبێتەوە، بەڵام ئەو بڕوای زۆری بە خۆی دەبێت، هەرگیز باس لەوە ناکات بۆچی وڵاتەکەی مەسەلەی عێراقی لە کۆڵ نابێتەوە، دووبارە لە ساڵی ٢٠٠٥ دیاردەی لوتبەرزییەکەی دەگرێتەوە، بەڵام وەك ساڵانی ٢٠٠١و ٢٠٠٢ نەبوو. ئەو کە لە بارەگاکەی خۆیدا لە ١٠ داونـنگ ستریتەوە وای دەزانی تەنها ئەو دەتوانێت بەرنامەکانی حکومەتەکەی کە بڕگەکانی بریتین لە چاکسازی پەروەردەو تەندروستی جێبەجێ بکات، وەك چۆن لە کاروبارە سەربازییەکان دەستی دەرەکییەکان بوارەکەی لار کردبوو، بەوەش خزمەتگوزارییەکان و گیانی کارکردنی کارکەرەکانی لاواز کردبوو، بۆیەش قازانجی سامانە تایبەتییەکان لەو بوارەدا دێتە خوارەوەو زۆریش کەم دەکات. پێش ساڵی ٢٠٠١ بەرپرسەکانی هەڵبژاردنەکانی وایان دەزانی کەوا بلێر زۆرتر لە ئەنجامی بڕیارەکانی رادەگەیاند، جا چ لە سەرەتای جڤینەکە بوایە یان لە کۆتاییەکەیدا.

یەکێك لە وەزیرە کۆنەکان کە لە دیسمبەری ساڵی ٢٠٠٤ کێشەیەکی لەگەڵ ئەودا هەبوو وتبووی:

لەو حکومەتەدا دەسەلاتی مەرکەزی کاری زۆر بۆ دەکرا، کەمیش دانوستانی لۆژیکی لەسەر هەموو ئاستەکان لەبار بوو. ئەنجومەنی وەزیرانی ئەو رۆژەش وا دەزانم خراپ نییە، بڕیاریش دەر ناکات، ئەوانەش هەموو نیشانەی نالەباری حکومەتەکەیە لەو وڵاتەدا. بلێر هەر لە ساڵی ٢٠٠٣وە دەسەلاتەکانی لە بن دەستی خۆیدا بووە، کەم گوێی لە ئامۆژگارییەکان راگرتووەو پرسی بە وەزیرەکان نەکردووە، تا گەیشتۆتە ئەو رادەیەی بایەخی بە بۆچوونەکانی هەردوو وەزیری دەرەوەو بەرگریش نەداوە، ئەوەش لەوەدا رەنگی دایەوە کەوا نەیتوانی لە نەتەوە یەکگرتووەکان بڕیاری دووەم وەرگرێت. دەڵێن گوایە کە جاك سترۆ لە دوورگەی ئازور لە رۆژی ١٦ی مارسی ٢٠٠٣ گەڕاوەتەوەو رۆژەڤەکەی بە سەرۆك وەزیران نیشانداوە، سترۆ لەو کاتەداو لە گەرمەی شەڕەکەدا نیازی بوو بە بلێر بسەلمێنێت هێزە بریتانییەکانی ناو عێراق کە بەغدا گیرا تەنها کار بۆ ئاشتی بکەن، پشتیوانی سیاسیو مەعنەوی تەواوی داگیرکردنەکە بکەنو بەس. دۆناڵد رامسفیلد بەئاشکراو بەروونی وتبووی:

ئێمە بە تەنهاش بین، دەچینە ناو عێراق، سوپاکەمان ئامادەیە ئەو وڵاتە بگرێت، هیچ پێویستمان بە یارمەتیو کۆمەکی بریتانییەکانیش نییە.

بلێر ئامۆژگاریو راسپاردەی سترۆی بە هەند وەرنەگرتووە، بۆیەش لەودەمانەدا سترۆ دەست لەکار دەکێشێتەوەو ئەوەش

کاردانـەوەی نێگـەتیفی لەسـەر کارنامـەی بلێـر هەبووە، لەسـەر ئاستی ناوو پێگەی بریتانیا بەرامبەر ئەمریکاو وەستانیان لە رووی قـەیران‌و پێشـهاتەکان لاوازیـش بـوو. یـەکێك لـەو رەوشـتەی بلێـر هـەیبوو کەسـەکانی بەرامبـەری بـە سـووك سـەیر دەکـرد، کەسێکی ئاگادار لـە بارەگای سەرۆك وەزیرانەوە دەگێڕێتەوە، کە وەزیـری دەرەوەو سـەرۆك وەزیــران پــاش دەرچــوونی ریفراندۆمەکــەی فەرەنســا لەســەر دەســتوورەکەی یـەکێتی ئـەوروپی، کـە ئەنجامەکـەی نـەخێریان بـۆ دەستوورەکە دابوو، بە یەکەوە قسەیان کردبوو، بلێـر بـە سووکییەوە سەیری کردووە. سترۆ لەگەڵ نەخێردا بوو بۆ دەستوورەکە کە لە ساڵی ١٩٧٥ رای گشتی لە ریفراندۆمێکەوە دەنگیـان بـۆی دابـوو، بۆیـەش ئـەو دەرئەنجامەکەی فەرەنسای پێ خۆش بووە، دەڵێن کە بەیەکەوە لەسـەر ئـەو ئەنجامـە قسـەیان کـردووە، بـە نـزمبینین‌و بـە رقـەوە وتوویـەتی (قەحبە)، کە قسەکە بڵاودەبێتەوەو زوو بە نادروستێ دوور لە راستی بـە رەسمـی وەڵامـی دراوەتـەوە، بـەڵام چیرۆکەکەو قسـەکە زۆرو خێـرا بڵاودەبێتـەوە. سـترۆ ئەگـەری لێـدانی سـەربازی پێشـوەختی مەڵبەنـدە ناوەکییەکەی ئێران بە (شێتی) پێناسە کردبوو. لەسەر ئەو بۆچوونانە بلێـر پێگـەی جـاك سـترۆ دادەبـەزێنێت، لـە مـانگی مـایۆی سـاڵی ٢٠٠٦ (مارگرێـت بیکێـت) ی ناشـارەزا لـە بـواری دەرەوە لـەو پۆسـتەی ئـەو دادەنێت، هەروەها بۆ وەزارەتی بەرگریش وەزیرێکی نـوێ دەستنیشـان دەکات، جیف هۆن ئەو وەزیرەی لـە کـاتی شـەڕەکاندا پشـتیوانی بلێـری کردووە دەیگۆڕێت.

## قەیرانەکەی لوبنان

لەگەڵ پەیدابوون و سەرهەڵدانی قەیرانەکەی لوبنان لە ساڵی ۲۰۰٦ دا، پەلاماردانەکەی ئیسرائیل بۆ سەر لوبنان، بلێر دوو وەزیری دەرەوەو بەرگری لاوازو کەم ئەزموونی هەبووە، هەردووکیان نەیانتوانی بەرگری رووبەڕووبونەوەکەی بۆش و بلێر بگرن بۆ شەڕ راگرتنەکە، چونکە هێرشە ئاسمانییەکانی ئیسرائیل بۆ سەر پێگەکانی حیزبولا بەردەوام و دژوار بوون، لە هەموو لایەکیش رەخنەیان ئاراستە دەکرا. ئەو بوردمانە دژوارە لەسەر ژێرخانی لوبنانی هیچ کاریگەری نەبوو لەسەر راگرتنی مووشەکەکانی ئەو حیزبە لەسەر ئیسرائیل و توانا سەربازییەکەی لاوازو شکست نەکردبوو. بلێرو بۆش بە یەکەوە ئیمزای بەیانی لوتکەی هەشت وڵاتە گەورەکەیان لە سانت پترسبۆرگ کردبوو، بۆ ناردنی خێرای هێزە فرەڕەگەزەکان بۆ ناوچەکە تا بە زووترین کات شەڕەکە راگیرێت.

## هەڵوێستێکی بەدڕەوشتانە

لە نمایشی پرێس کۆنفرانسێك کە لە رۆژی ۲۸ ی یولیۆ لە واشنتۆن بەسترا، هەردووکیان رازی نەبوون فشاری دبلۆماسی بکرێت بۆ ئاگربەستەکە. تەنها ئەو دوو سەرکردەیە لە هەموو جیهان وایاندەزانی بە پێکانی پێگەکانی لوبنان و بۆردومانی باڵەخانەکان لە ناوچە نیشتەجێیەکان (حزب الله)ی لوبنانی دەشکێنن. لەناو ئیسرائیلیش

رەخنە لەسەر ستراتیژیەتی ئیسرائیل دەبیسترا، بۆیە قسەکانی ئەوان لەسەر بەهاکان بە ڤالاّیی دەمایەوەو سەدای نەبوو، نەدەکرا لەسەر هەڵوێستەکانی بلێر لە رووی ئەخلاقییەوە بەرگری لێ بکرێت، ئەو هەڵوێستە لە سەرەتاوە شکستی سەربازی دەگەیاند. ئەو لە لوس ئەنجلوس وتبووی:

کەوانەی توندڕەوی لە خۆرهەلاّتی ناوەڕاست بەرین دەبێتەوە.

لەگەڵ بۆش خۆیان لە شکستەکەی ناو عیراق دوور دەگرت، بەوەش زیاتر ناوچەکەیان گڕدارتر کرد، ئەوەی جێگای رامانە لوبنان نابێتە عێراق، بۆیەش پەرلەمانتارە میانڕەوەکانی حیزبی کرێکارانی بریتانی لە پەرلەماندا هاواریان لێ هەڵساو وتیان (بەسە...!)، بلێریان ناچارکرد بەئاشکرا لە مانگی سێپتەمبەری ساڵی ٢٠٠٦ دا بڵێت من ئەوە دوا جارە لە کۆنگرەی حیزب بەشدار دەبم.

## شوێنەوارە کارەساتبارەکە

کە گۆڤاری لانسیتی پزیشکی لە مانگی ئوکتۆبەری ساڵی ٢٠٠٦ لێکۆڵینەوەیەکی زانکۆی جۆنز هۆبکر بلاّودەکاتەوەو دەنووسێت کەوا ٦٥٠ هەزار کەسی سڤیلی عێراقی لە مانگی مارسی ساڵی ٢٠٠٣ دا لەناوچوون، ئەوەش شوێنەوارێکی ترسناك و کارەساتباری لەسەر بلێر دروستکردبوو. لەسەر ئەو ئامارەش وەك هەموو کارێکی ئاسایيان قسەکەرێك بە ناوی بلێرەوە ئەو ژمارەیەی بە نادروست وەسفکردبوو. بەلاّم ئێستا بۆمان روونەبێتەوە کەوا ڕاوێژکارە زانستکارەکان لە

وەزارەتی بەرگری ئەو لێکۆڵینەوەیان بە (دروست)و (هاوسەنگ) پێناسە کردبوو، داواش کرابوو بە ئاشکرا رەخنە لەو لێکۆڵینەوە نەگرن و لەوەیاندا ئاگادارو هوشیاربن. بەرپرسێك لە وەزارەتی دەرەوە وتووی پێویستە حکومەت لە بایەخی لانسیت کەم نەکاتەوە، کە حیزبەکەی جۆرج بۆش دەسەلاتی لە ئەنجومەنی نوێنەران و پیرەکان لە مانگی نۆڤەمبەری ساڵی ٢٠٠٦ لە دەستدەدات. هەستدەکات دەبێ بەشێك لە سیاسەتەکانی بگۆڕێت، کە جاران زۆر بە لاملی کاری پێوە دەکرد، بۆیەش دوناڵد رامسفیلد لە پۆستی وەزارەتی دەرەوە دووردەخاتەوەو لە شوێنەکەی ئەو کەسێکی عاقڵی وەك (رۆبرت گیتس) دادەنێت. هەر لەو پلانەدا دەسەلاتی جیگری سەرۆك دیك تشینی لە ئاست وەزیری دەرەوە کوندالیسا رایس کەم دەکاتەوە. کوندالیسا بۆش بەوە رازی دەکات کەوا دانوستان لەگەڵ هەردوو وڵاتی سوریاو ئێران ساز بکات، بەڵام تەنها لە بواری ئەو کۆنگرە لۆکاڵییە هەرێمایەتییەدا کە سەرۆك وەزیرانی هەڵبژێردراوی عێراق نوری ئەلمالیکی داوای سازکردنیان دەکات. لە مانگی ئەپریلی ساڵی ٢٠٠٧ دا بۆش لە هەنگاوێکی دواکەوتوو ژمارەی هێزە ئەمریکییەکان لە بەغدا زۆرتر دەکات، بەڵام بریتانیا هێزەکانی لە چواردەورەی بەسرا کەم دەکاتەوە.

## سالی کۆتایی

سالی ۲۰۰۷ بۆ تۆنی بلێر سالی کۆتایی بوو، ئەو بە دەنگی زۆرینەی ۱۷۹ کورسی پەرلەمان گەیشتبووە ئەو پۆستە، وا دەسەلاتەکەی جێدەهێلێت پاش ئەوەی لە هەلبژاردنەکەی مایۆی سالی ۲۰۰۷ دا لە سکۆتلەنداو ویلزو لە هەلبژاردنە لۆکالیەکانی ئینگلترا شکستی زۆری بەردەکەوێت، ئەگەرچی لە هەلبژاردنە تەواوکەرەکاندا سیماو دەنگی باشتری دەبێت، بەلام بلێر دەرواتو میراتێکی وایان بۆ جێدەهێلێت کە زیان بە هەموولایەکیان دەگەیەنێت. بۆیەش بە کۆتاییەکی ناخۆش دوماهی بە دەسەلاتی بلێر دێت، لە رۆژی ۲۷ی یۆنیۆی سالی ۲۰۰۷ بلێر دەست لە پۆستەکەی دەکێشێتەوە، لە ئەنجامدا گۆردن براون ئەوەی لە پاش ئەو دێت دەکەوێتە مانگی هەنگوینی زۆر خۆش، بۆیە لەو خۆشیەدا داوا دەکات لە مانگی سێپتەمبەردا هەلبژاردنی پێشوەخت ساز بکرێت. لەو دەمانەدا جەماوەرەکە وا هەستدەکەن قەیرانەکەی عێراق کۆتایی هاتووەو ئەو کێشانەی لە سەردەمی بلێر هەبوون نەمان. لە ناو عێراقیش هێزە بریتانیاییەکان لە بەسرا دەکشێنەوەو براونیش لە سازکردنی هەلبژاردنی پێشوەختیش پەشیمان دەبێتەوە، پاش ئەوەی هەستدەکات لە ریفراندۆمو راپرسییەکاندا پێشکەوتنی گەورە بەدەست هاتوون.

# بەشی شازدەهەم

## بۆش و بلێر لەرووی سیاسییەوە گەمە بە کارتی ئایین دەکەن

نووسەری کتێبی (ئیمپراتۆریەتی لووتبەرزی) کە بابەتێکە لەسەر عێراق، لە لایەن سەرۆکی یەکەی بن لادن لە وەکالەتی هەواڵگری ئەمریکی (مایکل شیور) ەوە نووسراوە، دەڵێت:

(لوتبەرزی رووخسارێکی زۆر خراپ نییە بۆ ئەمریکا کە دیموکراسی فەوری بنیات دەنێت، خراپییەکە لەوەدایە کە لوتبەرزییەکە لە نەزانینەوە سەرچاوەی گرتبێت).

یەکێك لە رۆژنامەنووسە هەر نزیکەکانی بلێر، فیلیپ ستیفنز کە لە رۆژنامەی فایننشال تایمز لە رۆژی ١٤ی یولیۆی ساڵی ٢٠٠٦ دا وتاریکی لەژێر ناونیشانی (لوتبەرزیی ئەو داوەیە کە هەموو گرفتەکانی بلێری پێوە بەستراوەتەوە) نووسیبوو. ئەزموونەکەی منیش لەگەڵ بلێر هەر لە ساڵی ١٩٩٩ەوە دەستپێدەکات، ئەویش لە کاتی قەیرانەکەی کۆسۆڤۆ، لە قەیرانەکەی سیرالیۆنیش زۆرتر دەبێت، لە هەڵبژاردنە گشتییەکەی ساڵی ٢٠٠١ تا هێرشە تیرۆریستییەکەی ١١ی سپتەمبەر زۆرتر دیار دەکەوێت. سەبارەت بە جۆرج بۆشیش دیارە کەوا دیاردەی لوتبەرزییەکەی پاش هێرشەکەی ١١ی سپتەمبەر زۆر بە خێرایی زیاد دەکات، لە ماوەی بەشداریکردنەکەی لە هەڵبژاردنی سەرۆکایەتیدا لە ئامانجە سیاسییەکانی دەرەوەدا گەشە دەکات، ملی لەوە دەنێت بەرەو تەنهایی بڕوات، نەك دەستێوەردان،

## ئەوانە بۆ لوتبەرزی دەیانگرێت

پرسیارەکەمان ئەوەیە، بۆچی هەندێ لە سەرکردەکان ئەو نەخۆشییە دەگرن، هەموویان ئەو دیاردەیە ناگرن...؟

من وا دەزانم فاکتەرەکە دەگەڕێتەوە سەر چەند ڕەوشی دەرەکی تایبەتی و تایبەتی ناوەوەش بۆ هەموو تاکێك، سەبارەت بە لوتبەرزییەکەی بۆش و بلێر هەردوو فاکتەرەکە بە یەکەوە هۆکاری ئەو دیاردەیەن. سەبارەت بە بوونی فاکتەری دەرەکی بۆ لوتبەرزی سەرکردەکان زانای کۆمەڵناسی (دانیال بیل) وا دەزانێت ئەو دیاردەیە پابەندە بەو سەردەمە، بۆیە ئەو وتوویەتی:

لوتبەرزی ئەو سەردەمە هەموو کۆت و ئیلتزامەکان بە بەردەوام و گەیشتنەکان رەفز دەکاتەوە. جیهانی نوێش مەزندە دەکات چارەنووسەکە دەکەوێتە سەر ئەوەی (لە پاشان دێت). ئەوەی لە پاش ئەخلاق و لە پاش کارەسات و لە پاش کولتوور. جا ئەگەر ئەودەمانە مەزاجەکە وا بووبێت ئەوا زەحمەتە سەرکردەش خۆی لەبەر ئەو مەزاجە ڕاگرێت، بەڵام من وادەزانم بۆچوونەکەی بیل لەسەر ئەمریکا زۆرتر دەبێتە ماڵ، نەك لە سەر بریتانیا. دیارە کەوا چەمکی (لە پاشاندا) بەردەوام لەگەڵ ئەمریکییەکان تەریب بووە، ئەوەش بۆ ئەو سەردەمانە دەگەڕێتەوە کە سنوورەکان لە ولایەتە یەکگرتووەکان بەرەو خۆرئاوای کیشوەرەکە دەرباز دەبوون. کە فراوانبوونەکە بەرجەستە بووە سنوورە نوێیەکە کە بۆی دەرباز دەبوون، دەبێتە فەزا دەرەکییەکە. لە کولتووری میللی ئەمریکیدا بیری هەبوونی دەسەڵات بۆ ئەنجامدانی هەموو شتێك هەیەو دەبێ ئەوەش بمێنێت، ناکرێ

رەخنەشـی لێ بگیرێـت، ئـەوەش پێگەیـەکی ناوەنـدی لـە کولتـووری ئەمریکیدا هەیە. پاڵەوان دەتوانێت جیهان لە هەموو بـەدکارەکان پاک بکاتـەوە، ئامادەشـە بـۆ نەبەردییەکـە هێـزی ئـاگرین پـەیڕەو بکـات، ئـەوەش لـە زۆر لـە فیلمـەکانی هۆلیـودو لـە زۆربـەی زنجـیرە تەلەفزیۆنییەکانـدا بـوون و هـەن، هـەر لـەو بـوارەدا ئـەوەیان لـەناو کولتـووری گەنجەکانیانـدا هەیـە، کێشـەکەش لەوەدایـە کـە مەسـەلەکە بەرەو لوتبەرزی بڕوات.

## شانۆو ئەکتەر

لەبەر ئەوەی بریتانیا کولتووری ئەمریکی وەردەگرێت و پێشوازی لێـدەکات، بۆیـە زۆر ئاسـاییە بەشـێك لـەو کولتـوورە بـە خۆشـییەوە بقۆزێتەوە، دیارە ئەو کولتوورەش لە بریتانیا لە چاو ئەمریکا کـەمترە، دیارە کەوا کولتووری بریتـانی کۆنترەو زۆرتـر ئـەورووپی تـرە، ویست و پاوانخوازییە ئیمپریالییەکانیان بۆتە بەشێك لـە مێژوو. فاکتـەری زۆر روونی ئەوەی کـەوا روو لـە دیـاردەی لوتبـەرزی دەکرێـت ئەوەیـە کـەوا ئەو دوو وڵاتـە بـڕوا دەکـەن، ئەوانـە هێـزی گـەورەن و دەتـوانن کـار بـۆ بەرژەوەنـدی هەموو جیهان بکەن، ئەوەش تەنها بەوان ئەنجام دەدرێـت، ئـەوەش وا دەکـات سـەرکردەی لوتبـەرزو هەوابـەرز ببێتـە کەسـێکی موجاهیدو دەتوانێت بە بازوو هێزەکەی جیهان لـە هـەموو گرفتـەکان پاك بکاتەوە. سیماکانی بلێر زۆر لەوە دەوەشێتەوە کـەوا ئـەو کەسێکە ئامادەیی تێدایە کە کەسێکی لوتبەرز بێت.

یەکەم، وەك لە هەموو ئەو نووسینانەی لەسەر ئەو نووسراون، دەردەکەوێت ئەو لە سەرەتای ژیانیدا ئارەزووی ئەنجامی کاری هونەری هەبووە نەك سیاسەت، کە لە قوتابخانە بووەو لەکاتی ئەوەی لە قۆناغی زانکۆی ئوکسفۆرد بووە، ئەو زۆر شەیدای شانۆ بووەو نمایشی هونەری بەرزبووە وەك ئەکتەرو ئەندامی تیپێکی مۆزیکای رۆك کارکەربووە. بەوەش دیارە کەوا ئینتیمای سیاسی ئەو بە قەناعەتێکی ئایدۆلۆژی نەبووە. کە لە قوتابخانە بووە لەگەڵ پارێزگارەکاندا بووە، ئەو نەیتوانیوە فەلسەفەیەکی سیاسی دیاری هەبێت، دیار نییە ئەو رەگی قووڵی لە ناو حیزبی کرێکاراندا هەبووبێ، ئەو لە ناو سیاسەتدا بواری بۆ رەخساوە شانۆیەکی گەورەی بۆ ساز ببێت تا نمایشەکانی تێدا بەرجەستە بکات، لەوێ دەردەکەوێت کەوا بلێر توانای نمایشی زیرەکانەی بەرزی وەك سیاسییەکی هەمەجۆر تێدایە.

کە سیاسەتمەداران بایەخیان بە وردەکارییەکان نەدا، دیارە کەوا مەیلی نەرجسیەتیان هەیە، ئەگەر ئەکتەری سیاسی کەسێکی نەرجسی بوو، سەنتەرو بڕیارەکەی دەبێتە ئاوێنەی هەڵوێستە سیاسیەکەشی، لەسەر شانۆش رەنگ دەداتەوە، بۆیەش هەموو چاوەکان روو لەو دەکەن. بلێر ئارەزوویەتی زانیاریەکان تەنها لە یەك یان لە دوو لاپەڕە وەرگرێت، زۆر جار زانیارییە سەرەکیەکان ناخوێنێتەوە، کە باس لە رووی پشتەوەی بابەتەکە دەکات، بۆیەش سەیر نییە ئەگەر ئەو جۆرە سیاسەتمەدارانە ئوسلوبی نمایشو بەرێوەبردنی راگەیاندن بایەخی گرنگیان هەبێت. نەرجسیەت بۆ ئەکتەری سیاسی ئەوەیە کەوا وەرگرتنو گێڕانی رۆڵی پاڵەوان قسەی لەسەر نییە.

## درۆ بووەتە عادەت

سیمای دووەم لە کەسایەتی بلێر لەسەر رامانەکانی خۆیەتی، ئەو بەردەوام وا دەزانێت ئەو کاردەکات رۆڵی باش بگێرێت، نووسەرو رۆژنامەنووس جیفری ویتکروفت دەڵێ من ئەو خەسڵەتە بە روونی لە کەسایەتی بلێردا دەبینم، ئەویش بە رەوشتی ئەو کەس و رێبازانە دەچێت کەوا لە سەدەی شازدەهەم پەیدابوون کە دەیانووت، (بۆ تاکە خاوێنەکان هەموو شتێك خاوێنە)، واتە ئەوەی ئەوانە دەیکەن پاك و بێگەردە. ئەوەی هەستدەکات، یان وا بیردەکاتەوە کەوا هەرگیز هەڵە ناکات، ئەوە کۆنترۆڵی لەسەر رەوشتی نامێنێت، ئەوانەی وا دەزانن درۆ ناکەن و بەردەوام راستی دەبێژن، ئەوە راستییەکان زۆر بەئاسانی و بەسادەیی دەشارنەوە. لە ساڵی ٢٠٠٣ دا بلێر زۆر بە شانازی و بە شکۆوە وتبووی:

توانیمان چوار زۆردارو دیکتاتۆر لە وڵاتانی کۆسۆفوو سیرالیۆن و ئەفغانستان و عێراق لەناو بەرین.

ئەوەی شایانی باسە کەوا پرۆسەکەی کۆسۆفۆ لە ساڵی ١٩٩٩ ەوە لەلایەن هێزەکانی پەیمانی ناتۆوە بووە، لەو پرۆسەیەشدا پشتیوانی دبلۆماسی روسیشیان هەبووە، بەڵام بلێر تەنها لە سیرالیۆندا رۆڵی زۆر کاریگەرو سەرکەوتووی هەبووە، هێزەکانی بریتانی بە بەرنامە لەگەڵ هێزەکانی نەتەوە یەکگرتووەکان کارکەر بووە، سەبارەت بە ئەفغانستانیش پرۆسەکە لەلایەن هێزەکانی موخابەراتی ئەمریکییەوە بووە کە لە ساڵی ٢٠٠١ بە هاوکاری هێزە تایبەتییەکانی ئەمریکی ئەنجامیاندا. سەبارەت بە عێراقیش دەسەڵاتەکە ئەمریکی بووە،

ئەگەرچـــی بریتانییـــەکان وەك هاوبەشـــێکی گـــەورەی ســـەربازی بەشداربوون، لـەو شـەڕەدا بلێـر رووبـەڕووی بـۆش بۆتـەوە بـە توندی قسەی لەگەڵدا کردووەو ئەو نەرمی کێشاوەو پاشگەز بۆتـەوە. ژەنـراڵ کۆڵن پاوڵ کە ئاگاداری نزیکی پەیوەندی نێوان بـۆش‌و بلێـر بـوو، ئـەو بــە (ئــەنتۆنی ســیلدون) ی وتــووە، ئــەوەی کتێبێکــی یاداشــتنامەی دۆستانەی لەسەر بلێر نووسیوە دەڵێت:

من نازانم بۆچی لە کۆتایی هەموو کارنامەکاندا بلێر پشتیوانی لە بۆش کردووە، مـن ئـەوە بـە کارێکی شـۆك دەزانم، ئێسـتاش تـێ ناگـەم بۆچی ئەو لە هەموو شتەکانی بۆش هاوسۆزو هاوکارە.

ئەگەر سەیری رووداوەکانیش بکەیت ئـەوا میللـەتی بریتـانی وەك ئەمریکییەکان لە رۆژی ١١ ی سپتەمبەر هێرشی تیرۆریستی نەکراوەتـە سەر، نازانم ئەو دوو کەسە چۆن گەیشتنە ئـەو قەناعەتـە کـەوا سـەدام حوسێن مەترسی لەسەر ئارامی جیهان هەیە...؟ بلێر مەترسی هـەبوو، بەڵام هەرگیز کاردانـەوەی نـەبووە، مـن‌و جـاك سـترۆ دەمانویست ئـەو پیاوە بـوروژێنین، بـەڵام ئـەو بـە قسـەی نێمـە دەجوڵـاو ئامـادە دەبـوو، بەڵام کە سەرۆکی دەبینی ئەو وزەیەی نەدەما، سارد دەبۆوە.

## کارتی ئایین

کە بیر لەو کارە دەکرێتەوە هەستدەکەین لاوازییەك هەیە، بەلام رەنگە مەسەلەکە هەر ئەوەندە بێت کەوا ئەو دوو کەسە لەسەر بەرنامەیەك حەماسیان هەیەو گەرمن لەسەر کارەکەو بە گرنگیشی دەزانن، دەیانەوێت لایەنە ئاسانەکانی ببینن و چاو لە ئالۆزیەکانی بپۆشن. بلێر باوەڕە ئاینییەکانی بەو پەیوەندییە دەبەستێتەوەو بوونی خوا لەلای ئەو رۆلی هەیە، بلێر کەسێکی کریستیانی بە باوەڕەو بایەخی زۆریش بۆ ئیمامە کاسۆلیکیەکەی دادەنێت، بەلام ئەوەیان لە رووکاردا بە سووکی نیشاندەدات، چونکە ئەگەر هەر سیاسەتمەدارێك بە کارتی ئایین گەمە بکات و ئەو کارتە نیشان بدات، ئەوە ئەستەمە لە خولی تری هەلبژاردندا بباتەوە، دیارە ئەوەش لە ئەمریکادا هەیە.

لە رۆژی ٤ ی مارسی سالی ٢٠٠٦ دا لە دیمانەیەکی تەلەفزیۆنیدا، رەنگە دلنیابووە لەوەی کەوا لە پۆستەکەی وەك سەرۆك وەزیران نامێنێتەوە، لەوێدا بلێر لە بڕوا ئایینەکانیدا بە پارێز نەبوو، سەبارەت بە عێراق وتبووی:

ئەگەر بڕوات بەو جۆرە کارانە هەبێت، دەبێ بزانیت ئەحکامەکان سەرچاوەیان خەلکەکەیە، ئەگەر بڕواشت بە خودا هەیە، ئەوە سەرچاوەکە هەر خودایە.

ماناکەش ئەوەیە کە لێپرسینەوەو ئیعتبارەکەش سەرچاوەکەی دەنگدەرەکان نییە، بەلکو خوایە. ئەو جۆرە بڕوایەش هەستکردن بە لوتبەرزی کەم ناکات، بەلکو بەرزو زۆرتری دەکات.

سەبارەت بە حاڵەتی ئیدمان لەلای بۆش وەك لایەنی کەسایەتییە ئاینییەکەی گرنگو پڕ بایەخە. ئەو لە ساڵی ١٩٨٦ دا کە لەگەڵ قەشەی موبەشر (بیلی گراهام) لە خانووە هاوینەکەی بنەماڵەکەیان لە ولایەتی مین کە باوکی جێگری سەرۆك بووە کۆبۆتەوە، لەوێ لەسەر دەستی ئەو پەیمانی بە کریستیانیەت داوە.

بۆشی کوڕ وا دەزانێت کەوا خالیق نەك تەنها هێزێکەو لەگەڵ هەموو هەنگاوەکاندایەو بەس، بەڵکو هێزێکە بەرەو پێشەوەشمان دەبات، من هیچ گومانم نییە کەوا هێرشەکەی ١١ ی سپتەمبەر دەبوایە رووبدات، چونکە وڵاتەکەی ئەو پێویستی بەو ئەزموونە هەبووە. جارێکیان بە وەزیرێکی فەلەستینی وتبوو:

من لەلایەن خالیقەوە پشتیوانی دەکرێم، ئەو بە منی وتووە، جۆرج برۆ بەرەو عێراق تا ئامێری زوڵمو زۆرداری نەهێڵیت، منیش دروست وام کردووە.

جیفری بیریت، مێژوونوسی ژیاننامەی چەند سەرۆکێکی ئەمریکی وتوویەتی:

ئەو زمانە هیچ کام لە سەرۆکە ئەمریکییەکان لە مێژووی ئەمریکادا بەکاریان نەهێناوە. لە جیهانی بۆشو بلێر خالیق هێزێکە پاڵەوانەکان بەرەو رووبەڕبوونەوەی واقیعیان دەبات. لوتبەرزی مەسەلەیەکە ناکرێ بایەخی پێبدرێت، دوژمن کەسێکی بێ بەختەو بۆیەش پاڵەوانەکە دەبێ لە قۆناخێك لە قۆناخەکاندا، رووبەڕووی ببێتەوە. ئەوانە وا هەست دەکەن جەزای ئەو کارمیان خودا لە بەهەشت پاداشتیان دەداتەوە.

## ڕەوشی تەندروستی

بۆش‌و بلێر رای گشتیان سەبارەت بە حاڵەتی تەندروستییان چەواشە کردووە، هەموو دەمێك ئەو دوو سەرۆکە وا دیاربوو کەوا فۆرمیان جوانەو تەندروستیان باشە، بەڵام ناتوانین وردو باش بزانین ئەوانە چ و چەند جۆرە دەرمانیان بەکارهێناوە، ئەوەش نازانین ئەو دەرمانانە چەند رۆڵیان هەبوو ئەوانە لوتبەرز بکات، خۆیان بە مەزن بزانن. لە هیچ لیست‌و تۆمارێکدا دیار نییە کەوا ئەو دوو سەرکردەیە خەمۆکییان هەبووە، خۆ ئەگەر لوتبەرزیشیان هەبووبێت ئەوا لە جۆرە بێگەردەکە بووە، کە لە پۆستە ناسك‌و گەورەکاندا دەردەکەوێت. ئێمە زۆر بە وردی باسی تەندروستیمان کردن، ئێستا پێویست دەکات سەیری وردەکارییەکان بکەین تا دڵنیابین ئەوانە نەخۆشی لوتبەرزی‌و خۆ بە زل زانینیان هەبووە.

## تەندروستی بلێر

لە رۆژی ١٩ ی ئوکتۆبەری ساڵی ٢٠٠٣ دا هەواڵێك بڵاودەکرێتەوە کەوا بلێر دەچێتە نەخۆشخانەی (ستۆك ماندیفیل) ی نزیك بارەگاکەی لە تشیکرز بۆ بەسەربردنی پشووی کۆتایی هەفتە. پاشان لەلایەن حکومەتەوە ئەو هەواڵە پشتگیری دەکرێت، پاشان بلێر دەگوازرێتەوە نەخۆشخانەی (هەمەر سمیپ) لە خۆرئاوای لەندەن بۆ وەرگرتنی چارەسەری دڵ، چونکە حاڵەتی لێدانی دڵی زۆرتر بووە. کە

بلێر هەر ئەو شەوە گەڕاوەتەوە داونینگ ستریت، لەوێ پێیان وتووە ڕەوشی زۆر باش بووەو هیچ سیمای ئەوەی دیار نەبووە کەوا نەخۆشی دڵی هەیە، بەڵام ڕایانگەیاندبوو کەوا ئەو لە نەخۆشخانەی هەمەر سمیپ چارەسەری دڵی کرابوو، لەو پرۆسەیەش زاراوەیەکی پزیشکی نادیارو نەزانراو بەکارهاتووە، بۆیەش گومان لەوە دەکرێت کەوا بلێر نەخۆشییەکی ترسناکی هەیە، ئەوەش لەوەدا دەردەکەوێت کە بیل کلینتۆن وتبووی:

کە ئەوەم زانی یەکسەر بۆ دڵنیابوون لە ڕەوشی تەندروستی پەیوەندیم بە بلێرەوە کردبوو، دیارە سەلامەتەو ڕەوشی جێگیرە، کە قسەشمان بە یەکەوە کرد. دەرکەوت ڕەوشی باشە، من زووترو لە مێژە دەزانمو ئاگادار بووم کەوا ئەو کێشەیەکی هەیە، خۆی چەند ساڵێك دەبێت پێی وتووم.

لە دیمانەیەکدا لەگەڵ کلینتۆن ئەو بە منی وتبور:

بلێر دەیوت من ئەو حاڵەتەم لە نەنووستنو زۆر کارکردنو بەکارهێنانی ئاستی زۆری کافیین تووش بووە. ئەوەش گومانەکەی زۆرتر کردبوو کەوا بلێر نەخۆشە.

لە ڕۆژی ٢٧ی ئۆکتۆبەر پەیڤدارێك لە بارەگای سەرۆك وەزیرانەوە لەسەر قسەکانی کلینتۆن وەڵامی داوەتەوەو وتویەتی:

سەرۆك وەزیران کێشەی دڵی نییە، ڕۆژانەش تووشی هیچ گرفتێك نەبووە. هەروەها بلێر خۆشی بەو شێوەیە لە دیمانەیەك لەگەڵ ئیستگەی بی بی سی وەڵامی کلینتۆنی داوەتەوە:

ئەوە یەکەم جارە من تووشی ئەوەیان ببم، منیش وتبووم،

ئەوەیان ئاساییەو چارەسەرکردنی نۆرماڵەو هەموو کەس تووشی ئەو حاڵەتە دەبێت. لە بیرەوەریەکانی وەزیرێکی پێشووی حکومەتەکەی (دیڤید بلونکیت)ەوە دیارە کە وتوویەتی:

پاش دوو رۆژ لە پرۆسەی چارەسەرکردنەکە تۆنی بە تەلەفۆن بە منی راگەیاندبوو کەوا ئەو گرفتی هەیە، لەو ماوەیەش هەستدەکەم ژانەکەم زۆرە، من ئەوە پازدە ساڵە ئەو گرفتەم لە دڵدا هەیە، دیارە کەوا ئەو جارە ناچاربووە بچێتە نەخۆشخانە، ئینجا من بەراستی زانیم ئەو نەخۆشی دڵی هەیە.

من لە رۆژی ٤ ی نۆڤەمبەر لە ئاهەنگی پێشوازی دبلۆماسیدا قسەم لەگەڵدا کردبوو، لەوێ هەستم کردبوو ئەو نیگەرانە، دیارە بە تەمەنیش گەورە بووەو گەورەبوونەکەی پێوە دیارە، لەو رۆژەدا دیاربوو دەموچاوی گۆڕابوو، هەروەها کێشیشی کەمی کردبوو، بۆیەش من دەپرسم دەبێ نەخۆشی دڵەکەی پەیوەندی بە زۆربوونی جوڵەی غودەی دەرقیەوە هەبووبێت، چونکە لە کەمبوونی کێشەکەی‌و لە جووڵە کەوتنەکەی ئەوەی نیشاندەدا.

## دکتۆرێك لەسەر پاسکیلەوە

لە مانگی دیسەمبەردا هەواڵێك بڵاودەبێتەوە کەوا دکتۆرێك زۆر بە پەلەو بە ماتۆرسکیلێکەوە گەیشتۆتە بارەگای سەرۆك وەزیران، دیارە کەوا رەوشی خراپی بلێر ئەوی بە پەلە گەیاندۆتە بارەگاکە، وتیان گوایە بلێر ژانە گەدەی هەبووەو دکتۆرەکەی چارەسەری

کـردووە، بـە بۆچـوونی رۆژنامـەکان، گوایـە ئـەو تووشـی هـەوکردنی ریخۆڵە کوێرە بووە. دکتۆرەکانی دڵیش لـە رەوشـی دڵـی بلێـر ئاسوودە نـەبوون، هەسـتیان بـە نیگـەرانی کردبـوو، چـونکە ئـەو دووچـاری رەوشێکی زۆر نائاسایی ببـوو، بـەڵام بـەوە بـەختیاربوون کـەوا لێـدانی گوێچکەکانی دڵ ژانە سك پەیدا دەکات، بەڵام بەوەش بەختیاربوون کە ئەوەشی نەبووە. هەر لەو رۆژەی رۆژنامەی دیلی میرور لە ٢٠ ی مانگی نۆڤەمبـەری سـاڵی ٢٠٠٣ دا راپـۆرتێکی لەسـەر تەندروسـتی بلێـر بڵاودەکاتـەوە، مەسـەلەی دڵـی ئـەو بـەنهێنی ماوەتـەوە، کـەم بـاس دەکرێت، بەڵام شاژن ئیلیزابێت ئاگاداری نەخۆشیەکەی ئەو بووە، بۆیە ئەو وتبووی:

ئەو بە منی وتبوو، کـەوا لـە مێـژە بـە دەست ئـەو نەخۆشـییەوە دەناڵێنێت. ئەوەش لەلایەن بیل کلینتۆنـەوە بـاس کرابـوو. پەیڤدارێك لـە نووسـینگەی سـەرۆك وەزیرانـەوە رادەگەیـەنێت ـەوا بلێـر هـیچ کێشەی تەندروستی نییەو دڵی زۆر باشە، پێشتریش کێشەی نەبووە، بۆ دڵنیابوون ئەوەش دووبارە بڵاودەکەینەوە.

بەڵام لە رۆژی یەکەمی مـانگی ئۆکتۆبـەری ساڵی ٢٠٠٤ راگەیانـدرا کـەوا سـەرۆك وەزیـران دەبەنـە نەخۆشـخانەی هەمـەر سمیـپ، دکتۆرەکەش وتبووی هاتنەکەی ئەو تەنها لە نارێکی لێدانی دڵی بـووە. بـەڵام لـە نەخۆشـخانەکەوە وتبوویـان کـەوا حاڵەتەکـە دڵەکوتـەی گوێچکەکانی دڵی بووە. چەند ساڵە قسەیەـ هەیـەو دەگوترێت کـەوا بلێر بۆ هاوسەنگیو راگرتنی دڵی دەرمـان وەردەگرێت، مـن لـە یـەکێك لەو زانایانەم پرسی کە زانیارییان لەسەر ئەو دەرمانە هەیە، ئایا ئـەو

دەرمانە کاریگەریی لاوەکی لەسەر بلێر هەیە، ئەو دەرمانەی تووشی لوتبەرزیو خۆ بە گەورە زانینی بکات. ئەو وتبووی هەمان داوام لەسەر ئەو دەرمانەو کاریگەریەکانی لە وەزارەتی دەرەوە لەسەر سەدام حوسێن لێکرابوو، بەڵام هەندێ کەس قسەی وا دەگێڕنەوە کەوا ئەو دەرمانە کاریگەریی لەسەر ئەو رەوشە هەیە. یەکێك لە دکتۆرەکان نامەیەکی بۆ نووسیبوم کەوا ئەو گومانی لەسەر دەرمانەکان هەبوو، بۆیە بەردەوام لە تەلەفزیۆنەوە چاودێری سەرۆك وەزیرانم کردبوو، ئەو بۆی دەرکەوتبوو کەوا پێشەوەی قژی لە پشتەوە هاتبوونە پێشتر، کە زانراوە چارەسەری دڵی بۆ دەکەن، هەستکراوە قژەکەی دووبارە گەڕاوەتەوە پشتەوە. بۆیەش دکتۆرەکە پرسیبووی رەنگە بلێر دەرمانی (ریغین) وەردەگرێت کە یارمەتیی گەشەکردنی قژ دەدات، کە کاریگەریی لاوەکی پێوە دیارە وەك خێرایی لێدانی دڵ یان دڵەکوتە. کە دکتۆرەکان زانیوویانە ئەو دەرمانی ریغین وەردەگرێت، زوو بە پەلە پێیان وتووە، دەرمانەکە راگرەو چیتر بەکاری مەهێنە. بەڵام ئەوەی گرنگە کەوا راستی کەسایەتی بلێر سەبارەت بە لووتبەرزییەکەی پەیوەندی بە نەخۆشی دڵەوە نییە. بلێر بەردەوام رەوشی تەندروستی خۆی لە دەنگدەرەکان شاردۆتەوە، بۆیەش رۆژنامەنووسێك ئەومیان بە فێڵو هەڵخەڵەتاندن دەزانێت. بلێر یەکەم سەرۆك حکومەت نییە، رەنگە دوا سەرۆکیش نەبێت ئەوە بکات، بەڵام ئەو لەو ماوەیەی لەو پۆستەدا بووە ئەوەی کردووە، ئەوەش بەشێکە لە لوتبەرزیو لەو رێگایەشدا فێڵی لە هاووڵاتیان کردووە.

لە هەفتەی یەکەمی هەڵمەتی هەڵبژاردنی سەرۆکایەتی بۆ یەکەم جار لە ساڵی ٢٠٠٠ دا رۆژنامەکان نووسیبویان گوایە جۆرج بۆش لە تەمەنی سی ساڵیدا بە سەرخۆشی گیراوە کە ئوتومبێلی لێ خوڕیوە. تا ئەو هەواڵە بڵاونەبێتەوەو کاردانەوەی خراپی لەسەر رەوشی هەڵبژاردنەکە نەبێت، زوو وتیان بۆش هەر لە ساڵی ١٩٩٩ دەزانرا کەوا ئەو لە کاتی گەنجیدا مەشروبی خواردۆتەوە، بەوەش مەسەلەکەیان تێدا بزرکردووەو مەسەلەکە ئاسایی بۆتەوە. بەڵام هەر لەسەر ئەو مەسەلەیە روونبۆتەوە کەوا بۆش بەردەوام مەشروبی خواردۆتەوە، ئەوەش تا پێوەی دیار نەبێت باش چاودێری کراوەو سەرپەرشتی کراوەو مەشروبەکەی زۆر بەنهێنی خواردۆتەوەو بەردەوامیش ئینکاری کردووە.

بۆش دەڵێت من لە ساڵی ١٩٨٧ ەوە کحولم نەخواردۆتەوە، بەڵام بە قسەی رۆژنامەکان دیارە قسەکە راست نییە، ئەو لە رۆژی ١٣ی یەنایەری ساڵی ٢٠٠٢ بە سەرخۆشیو بە مەستی بینراوە کە سەیری گێمێکی یاری فوتبۆڵی ئەمریکی کردووە، لە ئاکامدا بەر بۆتەوەو سەری بەر زەوی کەوتووە، لە بەربوونەوەکەیدا ئێسکێکی زامدار بووەو لای نێوچەوانی چەپی رووشاوە، ئەوەش لە رۆژانی داهاتوودا تەندروستی ئاڵۆز کردووە، بۆیە بە شێوەیەکی نادروست پسکویتی سوێری خواردووە، بەڵام دکتۆرێکی بریتانی کە سەردانی زانکۆی جۆنز هوبکنزی کردبوو، پەیوەندی بە من کردبوو، بە منی وتبوو کە ئەو پەیوەندی بە دەستەیەك دکتۆری گەنج کردبوو، ئەوان وتبوویان ئەگەرچی سەرۆك رەوانەی نەخۆشخانەی (والتر رید) کرابوو، بەڵام

نموونـەی خوێنیـان ڕەوانـەی نەخۆشخانەی (جۆنز هـوبکنز) کردبـوو، لـەوێ دەرکـەوتبوو کـەوا ڕێـژەی کحـول لـە خوێنیـدا گەیشـتبووە ٢٠٠ ملگم، بەڵام ئەو جۆرە قسانە لەلایەن کۆشکی سپییەوە نکوڵی لێکراوەو هـیچ نیشـانەیەکیان نەدۆزیوەتـەوە کـەوا سـەرۆك گەڕابێتـەوە سـەر مەشروب خواردنەوە.

## ئەو ناخوێنێتەوەو کەسێکی ڕۆشنبیریش نییە

جـاران وا دەزانـرا کەسایەتی تـاك ڕۆڵـی هەیـە لـە تووشـبوون بـە خولیابوون بە کحول، بەڵام ئێستا دەڵێن ئەو کەسایەتییە ڕۆڵی کـەمترە لە فاکتەرەکانی تری ئارەزووکردنی خولیابوون بە کحول.

ئەوەی ڕوونو ئاشـکرایە کـەوا کەسـایەتی هەنـدێ کـەس، بەشـێکی دانەبڕاوە لە عادەتی ئێدمان، ئەگـەر بتـوانن لەسـەر ئـەو خـووە زاڵبن. بـۆش نکـوڵی لـەوەدا ناکـات کـەوا کـەم دەخوێنێتـەوەو وتوویـەتی مـن کەسێکی ڕۆشنبیریش نیم، ئەوەش مانای ئەوە نییە وەك هەندێ کـەس دەبێـژن ئـەو کەسـێکی دەبەنگـە. ئەگەرچـی ئـەو خوێنـدکاربووەو خوێندوویـەتی، بـەڵام دەڵـێن ماڵـەوەو دەسـەڵاتی بنەماڵەکـەیان ڕۆڵـی هـەبووە بگاتـە زانکـۆی بیـل. ئـەو لـە کۆلێـژی یاسـای زانکـۆی بیـل دەرچـووەو خوێنـدنی ئابووریشـی لـە زانکـۆی هارفـارد تـەواو کـردووە، دیـارە تـەواوکردنی ئـەو دوو بـوارەش لـە خوێنـدن بـەبێ بەشـێك لـە زیرەکیش ئەنجام نەدراوە.

## ئاستی زیرەکی

ئەوانـەی دیمانـەیان لەگـەڵ جۆرج بۆشـدا بـووە، دەڵێن ئێمـە بـە ئاستی کـەمی زیرەکییەکـەی ئـەو سەرسام بووین، دیـارە ئـەوەش لـەوە سەرچـاوەی گرتـووە کـەوا ئـەو زوو زوو بـیری دەڕوات و تـەرکیزی نامێنێـت و سروشـتی زۆرتـر وەرگـرتنی نییـە، لـە دەربڕینـدا زۆر بـاش ناتوانێـت مەبەسـتەکەی بپێکێـت و بیگەیـەنێت، بـە کـورتی ئەوانـەش هەموو هێمـای ئـەوەن مێشکی ئـەو ئەرکەکانی بـە شێوەیەکی ئاسایی جێبەجێ ناکات.

فاکتـەری سـەرەکی سـەرکەوتنی جـۆرج بـۆش لـە هەڵبژاردنەکـەی ساڵی ٢٠٠٤ بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کەوا دەنگدەرەکان وا دەزانن ئەو خـۆی وەك کەسـێکی ئاسـایی نیشـاندەدات، ئـەو وێنەیـەی ئـەو ڕۆڵـی زۆری هـەبووە لـە سـەرکەوتنەکانی، چـونکە ئـەو زۆر دەڵـێ، مـن کەسـێکی ئاسـایم. جارێکیـان ژورنالیسـتێك لـە بـۆش دەپرسـێت، تـۆ دەتـوانی بـە زمانی فەرەنسی قسە بکەیت، ئەو لە وەڵامدا وتبووی:

نەخێر.. نا... من بە زەحمەت دەتـوانم بـە زمـانی ئینگلیـزی قسـە بکەم.

ڕوخۆشیەکەی بۆش و گاڵتەکردنی بەردەوامی بۆشی لە زۆر هەڵە و زمـان کـەوتن ڕزگـارکردووە، هـەر ئـەوەش ڕۆڵـی هـەبوو هاووڵاتیـان لـە هەڵبژاردنەکەی ساڵی ٢٠٠٤ دەنگی پێ بدەن.

## یەك جار دواكەوتووە

لەوەتەی بۆش پۆستی سەرۆكایەتی ئەمریكای وەرگرتووە، ساڵانە راپۆرتی رەوشی تەندروستی بڵاودەكرێتەوە، بەڵام یەك جار ئەو بڵاوكراوەیە دواكەوتووە. ئەنجامی هەموو راپۆرتەكانی خاڵێكی وای تێدا نییە جێگەی بایەخو سەرنج بێت، تەنها ئەو ماوەیە نەبێت كە ماوەیەك هەست دەكرا لێدانی دڵی ئاسایی نییە. بۆش ماوەیەك بوو قسەی نادروستی لە دەم دەردەچوو، ئەوانەش بووەتە مایەی گاڵتەپێكردن، ماوەیەكیش دكتۆرەكان سەرنجی ئەوەیان هەبوو كەوا رەنگە سەرۆك بۆش جۆرێك لە دیسلكسیای پێوەبێت، واتە خوێنلنەوەی زەحمەت، دەڵێن (نیل) ی براشی هەمان كەماسی لە خوێندنەوەدا هەیە. هەندێ گومان هەیە كەوا بۆش نەخۆشی A.D.H.D پێوەبێت كەوا تەركیزكردنی لاوازەو جوڵەشی لاری پێوەیە، ئەوەش تایبەتە بە كەسانی تەمەنی پێگەیشتوو، ئەو ئاڵۆزییەش لەگەڵ تەمەندا دەمێنێتەوە، كەوا بەردەوام جوڵەكانی ساز نینو تەركیزی تەواو نییەو تواناكەشی كەمە. ئەوەشیان یەكێكە لەو چوار ئاڵۆزییە نەفسییانەو سێیەمیشیان خەمۆكییە، لەگەڵ شێواوی لە پاش شۆكەوە دێتە پەیدابوون، هەروەها فاكتەری دابڕانیش هۆكارێكە كە لە ئاكامی مەستیو خواردنەوەی زۆری مەی سەر هەڵدەدات.

ئەو دكتۆرە دەروونیانەی بواریان سازبووە پشكنین لەسەر تەندروستی بۆش بكەن، دەڵێن ئەو تووشی حاڵەتێكی كلاسیكی كەسایەتی نرجسیەت هاتووە، ئەوەش حاڵەتێكی ئاڵۆزی دەروونی زۆر زەحمەتە. مێژووی دەستنیشانكردنی ئەو جۆرە ئاڵۆزییە دەروونییە

بەو دواییە لەلایەن کۆمەڵەی دەروونناسانی ئەمریکییەوە بڕیار دراوەو سەرەتای کۆششەکەش بۆ ساڵی ۱۹۹۰ دەگەڕێتەوە.

ئەو حاڵەتەش بە ریزێکی نەگۆڕەوە پەیوەندی بە خۆ بەزل زانینەوە لە خەیاڵ و لە رەوشتدا هەیە، کە پێویستی بە راکێشانی سەرەنجدان و نەمانی گونجانی سۆزەوە هەیە، ئەوەش لە سەرەتای تەمەنی گەنجییەوە سەرهەڵدەدات. لەلای ئەو کەسانەی رامانەکانیان زۆر ئاسایی بێت پەیدا دەبێت، کە دەخوازن بە نازەوە مامەڵەی تایبەتییان لەگەڵدا بکرێت، یان یەکسەر رامانەکانیان قبووڵ بێت. ئەوانە بەئاسانی کەسانی تر بۆ بەرژەوەندی خۆیان دەستەمۆ دەکەن و ئارەزووەکانیان پێ سازو گونجاو دەکەن، توێژینەوە دەروونیەکانی لەسەر تەندروستی جۆرج بۆش کراون، نیشانەی حاڵەتی قووڵتر لەوەیان تۆمارکردووە. زۆر لە توێژەرە دەروونییەکان دەنووسن کەوا سەرکردە سیاسییەکان وەك نەخۆش لە بن دەستی ئەوانەوە چارەسەری وەرناگرن، سیمگوند فروید بۆ نموونە کتێبێکی لەسەر ووٚرد ویلسون نووسیوە کە هاوڕێیەکی ویلسون هاوکاری کردووە، پەرلەمانتارێکی حیزبی کرێکارانی جاران توێژینەوەیەکی لەسەر بلێر نووسیوە.

## شێتی خۆبەزلزانین

دکتۆر جسنین فرانك کتێبێکی توێژینەوەی لەسەر بۆش نووسیوە، تێدا هاتووە کەوا سیمای کەسایەتییەکەی لەوە دەوەشێتەوە کەوا ئەو دووچاری شێتی خۆبەزلزانین هاتووە، دیارە پێویستی بە روونکردنەوەش نییە کەوا حاڵەتی خۆبەزلزانین پەیوەندی بە خووی لوتبەرزییەوە هەیە. دیارە کەوا ئاسان نییە هۆکارەکانی تووشبوونی بلێرو بۆش بە خووی لوتبەرزی بزانین، دیارە چەند فاکتەرێکی پەیوەندیی بە تاکی کەسەوە هەیە کە بوار ساز دەکات ئەو کەسە روو لەو خووە بکات، رەنگە فاکتەری تەندروستیش رۆڵی هەبێت، بەڵام هیچ هۆکارێکی دیار نییە. من وا دەزانم پێویستە کارو توێژینەوە لەسەر ئەو حاڵەتە بکریت بۆچی سیاسەتمەداران لە هەموو بوارەکان نەك هەموویان تووشی ئەو رەوشە دەبن. دیارە ئەوەش وەك دیاردەیەکی چەسپاو نییە بە کەسەکە، ئەو حاڵەتەش نییە کە بە ئاسایی سەرکردەکان دەگەیەنێتە ئەو پۆستە، ئەو سەرکردانەی دەگەنە ئەو پۆستە باڵایە ماوەیەك تووشی دەبن.

## وەرگێڕ لەچەنددێڕێکدا:

لە ساڵی ١٩٥٥ لە شاری دێرینی (هەولێر) لەدایکبووم.

ئامۆژگای تەکنەلۆژیای بەغدام تەواوکردووە.

تا لە وڵات دەرچووم فەرمانبەری شارەوانی هەولێر بووم.

لە ساڵی ١٩٩٨ەوە لە وڵاتی سوید دەژیم.

چاپکراوەکانم ...

لە یادی سەد ساڵەی شارەوانیدا، ساڵی ١٩٨٥ کتێبی (هەولێر )م بە قەبارەی ٣٦٥ لاپەڕە ئامادەو چاپکرد.

هەر لە شارەوانیدا لە ساڵی ١٩٩٤ دا، ١٢ ژمارەی ڕۆژنامەی(هەولێر)م دەرکرد.

کەلاوە... ساڵی ١٩٩١ ریپۆرتاژ، بۆ ئۆردوگاکانی دەڤەری هەولێر.
دیوەخانی ڤلێن... رۆژانەو ریپۆرتاژە، لە ساڵی ١٩٩٩ لە رۆژنامەی (ئاڵای ئازادی)ی زەحمەتکێشان لە دە ئەڵقەی درێژ بڵاوکرایەوە.
هەولێر... تا دبلن... ساڵی ٢٠٠٠ ریپۆرتاژ، زانکۆی ئازادی بەرلین.
بەغدا.... بۆ هەولێر!... ساڵی ٢٠٠٠ ریپۆرتاژ، سویدو سلێمانی.
مەملەکەتی ڤارگۆنەکان... ساڵی ٢٠٠١ ریپۆرتاژ، سلێمانی.
کاکە، ئەبو ئیسماعیل... ساڵی ٢٠٠١ ، سلێمانی.
بەسەرهاتی دەریاوانێکی خنکاو ساڵی ٢٠٠١ رۆمانی گابریل مارکیز، لە ژمارە ٢٥ی گۆڤاری (ئایندە)ی سلێمانی بڵاوکرایەوە، وەك نامیلکەش بڵاوکرایەوە.
دە رۆژەکەی هەولێرم، (١١) وتارو ریپۆرتاژ بوو لە گۆڤاری (گوڵان)ی هەولێرو رۆژنامەی (کورد) لە ئوستراليا بڵاوکرایەوە.
رێگای دوورم بۆ ئازادی، نیلسۆن ماندیلا، وەرگێڕان. هەولێر لە دەزگای موکریانی بڵاوکرایەوە.
سارد، یان گەرم، (١٢) ریپۆرتاژ بوو، لە رۆژنامەی (هەواڵ)ی سلێمانی لە یۆلیوی ٢٠٠١ تا یەنایەری ٢٠٠٢ بڵاوکرایەوەو وەك نامیلکەش بڵاوکرایەوە.
ڤارگۆنەکان، ریپۆرتاژو بیرەوەرییە لە دەزگای بەدرخان لە هەولێر ساڵی ٢٠٠٥ بڵاوکرایەوە.
مەملەکەتی کەلاوە، وتارو پێناسەی بیناسازی کوردییە وەك نامیلکە لە وەزارەتی رۆشنبیری لە هەولێر بڵاوکرایەوە.
کۆریا پێناسەو مێژووی کۆریای باشوور، لە خانەی وەرگێڕان لە

هەولێر ساڵی ٢٠٠٧ بڵاوکرایەوە.
هولۆکۆست... کتێبێکە لەسەر قڕکردنی جولەکە لە ئەوروپا، وەرگێڕان سەنتەری نما هەولێر ساڵی ٢٠٠٧.
دوو پرێنسیسی نازداری بێناز، دیاناو ماساکۆ... هەولێر دەزگای ئاراس ساڵی ٢٠٠٨.
مارتن لۆسەر، وەرگێڕانو ئامادەکردن، بەشێکە لە کتێبی ئاتوندوتیژی، سەنتەری مەسەلە هەولێر ساڵی ٢٠٠٨.
بەرەو کۆشکی ئالیزی ، شیراك، رویاڵ، سارکۆزی..و: خانەی وەرگێڕان، سلێمانی ساڵی ٢٠٠٨.
سێکسو پۆلیتیك، دیوێکە لە ژیانی دبلۆماتی فەرەنسای نوێ...و: دەزگای سەردەم ساڵی ٢٠٠٨
تەها حوسێن، نابینایەکی بینا، وەرگێڕانو ئامادەکردن.. دۆسیەیەك لە گۆڤاری نما ساڵی ٢٠٠٨
٩٥٥ دەقە لەگەڵ شێرکۆ بێکەس دیمانە دەزگای نما ساڵی ٢٠٠٨
دۆلار لە ئەمریکا، دوو بابەتی ئابوورییە....و : دەزگای ئاراس ساڵی ٢٠٠٨
مەحبوور، سەربردەو ریپۆرتاژە... سلێمانی ساڵی ٢٠٠٨
من رۆژنامەنووسم، جاسووس نیم... وەرگێڕان خانەی وەرگێڕان سلێمانی ساڵی ٢٠٠٩
مۆساد.. وەرگێڕان هەولێر .. بڵاوکراوەکانی ئاودێر ساڵی ٢٠٠٩
دانپێدانەکانی حاجی پاولۆ .. لە بڵاوکراوەکانی ئاودێر هەولێر ساڵی ٢٠٠٩

ترێنه خێرایەکی خۆرهەڵات... وەرگێڕان دەزگای موکریانی ساڵی ٢٠٠٩
ئامادەی چاپە:
هەتان... چەند وتارێکە لەسەر بیناسازی کوردەواری، لە ساڵی ١٩٨٨ەوە
ئامادەیە.
کاکە ئەبو خەلیل ... بەسەرهاتو گێڕانەوە .. سوید ساڵی ٢٠٠٨
سیڤییەکان ١.. کۆمەڵە دیدارێکە ساڵی ٢٠٠٢ - ٢٠٠٩
سیڤییەکان ٢ کۆمەڵە بابەتو دیمانەیە ساڵی ٢٠٠٢- ٢٠٠٩
جیهانی لە دیدی کۆشنێر ... وەرگێڕان ساڵی ٢٠٠٩
برادەرە جوانەکە، رەشیدە داتی ... وەرگێڕان ساڵی ٢٠٠٩
بۆکسە رەشە نهێنییەکە وەرگێڕان ساڵی ٢٠٠٨
دەسەڵاتی دوو ژن... ئەنجیلا مێرکلو ئیلیزابێسی شاژن ساڵی ٢٠٠٧ -
٢٠٠٨
بەهەشتی زیندان... وتارو ریپۆرتاژە لە ساڵی ١٩٩٦ەوەو بەبەردەوامی
دەینووسم، ئێستاش گۆشەی (برێف) لە چەندین گۆڤارو رۆژنامەو
ماڵپەڕەکانا لەوڵاتو دەرەوەی وڵات بڵاودەکەمەوە.

# بەرهەمەكانی خانەی وەرگێڕان

| ژ | ناوی کتێب | ناوی نووسەر | وەرگێڕ |
|---|---|---|---|
| ١ | دادگایی سوكرات | ی.اف.ستۆن | نیاز محمەد |
| ٢ | كوشتن بەبیانووی ناموس | د.هیمداد مەجید | حەسەن عەبدول كەریم |
| ٣ | راپۆرت بۆ گریكۆ | نیكۆس كازانتزاكیس | دلاوەر قەرەداغی |
| ٤ | شكست | ئەلكساندەر فادایۆف | حەمەكەریم عارف |
| ٥ | ڕاڕەوی مەرگ | كارل تشیسمان | عەلی محەمەد |
| ٦ | من ڕۆژنامەنووسم | كامیلیا ئەنتخابفردو فرانسوا نیكۆلۆو منی لطفی | شێرزاد هەینی |
| ٧ | لەمۆدێرنەوە بۆ پۆسـتمۆدێرنە | كۆمەڵێك نووسەر | ڕێبین رەسول |
| ٨ | كۆمۆنیزمی ئەورووپایی | فۆلفگانگ لیۆنهارد | د. كوردۆ عەلی |
| ٩ | جەنگی هەواڵگریی نێوان دەزگای هەواڵگریی ئەمریكا و ڕوسیا | سیلینا بلیدوسكا و جوناسان بلوتش | هێرش هەورامی |
| ١٠ | كوڕێك لەناودا | ستیفن دۆبینس | پێشەوا فەتاح |
| ١١ | ژنانی شۆخ و شەنگی دنیاو ئەژدیهایانی ڕۆژگار | ئەحمەد شەنوانی | ئەحمەد سەلام |
| ١٢ | جەنگی هەواڵگریی نێوان دەزگای هەواڵگریی ئەمریكا و ڕوسیا بەرگی (٢) | سیلینا بلیدوسكا و جوناسان بلوتش | هێرش هەورامی |
| ١٣ | زمان و عەقل و كۆمەڵگە | جۆن سیرل | عەبدوڵا مەحمود |
| ١٤ | چۆن لەبواری ڕاگەیاندندا سەركەوتن بەدەستدەهێنیت | جەلال فەرحی | لوقمان غەفوور |
| ١٥ | سەرمایەداری یان دیموكراتی؟ | مارك فاوربایێ | ئیسماعیل كوردە |
| ١٦ | ڕۆمانی تەپڵی باران | ئیسماعیل كادارێ | دلاوەر عەبدوڵا |
| ١٧ | بیرەوەرییەكانی جەنەراڵ دیگۆل | جەنەراڵ دیگۆل | خالید هەركی |
| ١٨ | ئەمریكا لە بەردەم چوار ڕێیاندا | فرانسیس فۆكۆیاما | ناسر سەلاحی |
| ١٩ | نیچە | جیل دۆلۆز | ڕێبین ڕەسوڵ ئیسماعیل |

| ژ | ناونیشان | نووسەر | وەرگێڕ |
| --- | --- | --- | --- |
| ٢٠ | خۆشەویستیی و وزەی دەروونی | د.یوری ریوریکوف | سۆزان جەمال |
| ٢١ | عەتر | پاتریک زۆسکیند | ئەرخەوان |
| ٢٢ | ئەردۆغان کێیە؟ | چەند نووسەرێك | زریان رۆژهەلاتی |
| ٢٣ | قومار لەسەر مەحالْ | سلاڤۆی ژیژەك | مەنسوری تەیفوری |
| ٢٤ | ژیان جوانە | کۆمەڵێك گفتوگۆ | هیوا قادر |
| ٢٥ | پێشبینێکی ئەفرەتلێکراو | جەنگیز ئیتماتۆڤ | جەوهەر کرمانج |
| ٢٦ | نادیار | نەوال ئەلسەعداوی | تریفە محەمەد |
| ٢٧ | تیرۆریزم و جەنگ | هاوارد زین | محەمەد سالح |
| ٢٨ | لەفەرهەنگی کەلەپوورەوە | هادی ئەلعەلەوی | تەیب عارف |
| ٢٩ | هەینە | سەلام عەبدوللا | محسن حسین |
| ٣٠ | هەڵپەی ئیمپراتۆرییانە | نۆم چۆمسکی | کامیل قەرەداغی |
| ٣١ | میدیای نێودەوڵەتی | تۆماس نێل ماکفیل | هەندرێن شێرزاد |
| ٣٢ | ئەوەیە مرۆڤ | فردریك نیچە | رێبین رەسول |
| ٣٣ | بونیادنانی دەوڵەت | فرانسیس فۆکۆیاما | ئیسماعیل کوردە |
| ٣٤ | سەدەکانی ناوەڕاست | کۆمەڵێك نووسەر | هەورامان وریا قانع |
| ٣٥ | پانتورکیزم | جیکوب لاندۆ | ئەبوبەکر خۆشناو |
| ٣٦ | عێراق وەك کۆمپانیایەکی وەبەرهێنان | پراتاپ چاترجی | ئەیاد خالد |
| ٣٧ | چارەنووسی شومی ئیمپراتۆرێك | پیرتزلف فرانسوی | هێمن جـوڵا |
| ٣٨ | لەمۆدێرنەوە بۆ جیهانگەرایی | ج.تیمونز ڕوبیرتس ، ئەیمی هایت | محەمەد حسێن |
| ٣٩ | رۆمیۆ و جولێت | ولیەم شکسپیر | عەزیز گەردی |
| ٤٠ | دیالۆگەکانی کرتایی سەدە | ریچارد کیرنی | دیار عەزیز شەریف |
| ٤١ | قەرەج | جان - پول کلیبیر | نوری سەعید |
| ٤٢ | مەم و زین (بەئینگلیزی) | ئەحمەدی خانی | عەزیز گەردی |
| ٤٣ | کورتە مێژووی زەمان | ستیڤن و. هاوکینگ | سامان عەبدوللا |
| ٤٤ | شەوکوتەکان | ئیبتسام ئەعیم | جەلال دەباغ |
| ٤٥ | سەرۆکی و نەخۆشی | دیڤید ئەوین | شێرزاد هەینی |
| ٤٦ | هاتا یۆگا | سوامی سڤان مارامـا | هاوبیر گامەران |

من وا هەست دەکەم ناوەرۆکی ئەم کتێبە بابەتێکی زیندووەو کەم لە کوردستان‌و ناوچەکەمان ئاژاوانە ئاو ڕی لێ دراوەتەوە، چونکە ماوەی حوکمڕانی سەرۆکەکانی ئەم ناوچەیە، تا مردنە لە کورسییەوە بۆ نەخۆشخانە، یان یەکسەر بۆ گۆڕستان بووە، لەو ماوەیەشدا کەس باسی نەکردوون‌و توێژینەوەی بابەتییانەیان لەسەر نەنووسراوە.

کتێبی دەسەڵات‌و نەخۆشی، کە لە لایەن وەزیری دەرەوەی بەریتانی پێشووتر (دیڤید ئۆوین) نووسراوەو لە ڕۆژنامەی ئەلقەبەسی کوێتی بە زنجیرە بڵاوکراوەتەوە، لێکۆڵینەوەیەکە لەسەر باندۆری سەرۆکە نەخۆشەکانی جیهان . بابەتێکە لەسەر باندۆری نەخۆشییەکان‌و چارەسەرکردنەکانی بەدەنی‌و دەروونییان، لەسەر بەڕێوەبردنی دەسەڵات‌و دەرکردنی بڕیارەکان، کە ئەنجامی بڕیارەکان کوێرانەو گێژانەو گەوجانە بووە.